**ئازاد عەلی عەبدوڵڵا**



# شۆڕشی
# مەشخەڵانی نوێی کوردستان
# ساڵانی ١٩٨١ - ١٩٨٨



**لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی و پێشمەرگەیی و ڕێکخراوەیی و کۆمەڵایەتییە**



پێشەکی و پیاچوونەوەی
د. ئەرسەلان بایز
ئەندامی مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ک)

**پێشکەشە :-**

به هەڵگرانی مەشخەڵو

شەهیدانی سەربڵندی

ڕێبازەکەی..

(کەم ژیانو کەڵ ژیان)

-نووسەر-

## ﴿ پێشەکی ﴾

ئەم کتێبە تیشك دەخاتە سەر ماوەیەکی مێژوویی گەلی کورد کە نووسەر خۆی تیایدا ژیاوەو هەموو ڕووداوەکانی بە چاوی خۆی دیوە. بۆیە دەتوانین بڵێین بەسەرهاتی شۆڕشی کوردستانە لە ساڵەکانی شۆڕشی نوێدا بە چاوی پێشمەرگەیەکەوە.

ئەو ڕۆژانەی ئەم کتێبە لە دوو توێی خۆیدا کۆی کردۆتەوە، ڕۆژانێکی گەلێ سەختو دژوار بوون. شۆڕشی نوێی گەلی کورد لە دوای هەرەسێکی گەلێ گەورەو لە دنیایەکی بێ ئومێدیدا لەسەر دەستی ئەم پێشمەرگە گیان فیداکارو خۆڕاگرانە هەڵگیرسایەوە، لە کاتێکا دەیان هەزار پارچە چەك دووچاری هەرەس‌و شۆڕشی (١٤) ساڵە جوانەمەرگ بوو، پێشمەرگەکانی (ی.ن.ك) لە ژێر سەرکردایەتی‌یەکی کارامەو لێهاتوودا چەخماخەی ڕوناکی‌یان لەو شەوە زەنگەدا لێدا. مێژووی ئەو ساڵانە بە خوێن‌و فرمێسك‌و ئارەقەی دەیان هەزار ڕۆڵەی ئەم گەلە بە گشتی‌و (ی.ن.ك) بە تایبەتی نووسراوەتەوە.

نووسەر ورد ورد هەنگاوی ناوە. تیشکی خستۆتە سەر هەموو ڕۆژو ڕووداوە بەرچاوو گرنگەکانی ڕاگواستن‌و بە عەرەب کردن‌و بە بەعسی کردن، ئەو سێ دڕکەی لەسەر دەستی ڕژێمی بەعس خزابوونە دڵ‌و دەروونی خەڵکی کوردستانەوە. کیمیاباران‌و ئەنفال‌و بە کۆمەڵ لە سێدارەدانی گەنجان، گۆڕی بە کۆمەڵ‌و ژوورەکانی سێدارەی ئەبو غرێب‌و قەسابخانەی موسڵ. هەموو ئەمانە نەیان توانی سەری بەرزی ڕۆڵەکانی گەلەکەمان نەوی بکەن.

ئەم کتێبە هەر بە تەنیا باسی لەزەبرو زەنگی دوژمن‌و لەموعاناتی گەلەکەمانی نەکردووە، بەڵکوو باسیش لە هەنگاوە دیموکراتی‌و مەدەنی‌یەکانی شۆڕشەکەی کردووە لە خوێندن‌و ئازادی بیروڕاو ئەنجومەنی گوندەکان‌و ڕۆژنامەو گوێگرتن لە ڕوناکبیرانی نەتەوەکەمان.

من ئەرك‌و ماندوو بوونی نووسەر بە بەرزی دەنرخێنم. چونکە هیلاکی‌یەکی زۆری دیوە بۆ نووسینەوەی ئەو مێژووە پڕ لە سەروەری‌یانەو بە دڵنیاییەوە دەڵێم کەلێنێکی گەورە لە کتێبخانەی میللەتەکەمان پڕ دەکاتەوە، بە تایبەتی قۆناغی سەرهەڵدان‌و ڕۆژانی شۆڕش.

ئومێدیش دەکەم نووسەرانی پێشمەرگە ئەوانەی لەو شاخانە ژیانو بە چاوی خۆیان سەدان ڕوداوو کـاری نموونـەییو فیداکـارییو چەرمەسـەرییان دیـوە ئەزموونـەکانی خۆیـان بنووسنەوە بۆ ئەوەی نەفەوتێنو لە داهاتوو ڕۆڵەکانمان بزانـن بـاوو باپـیران چۆن ژیـاونو کاروان بە چەندین قۆناغی سەخت گەیشتۆتە ئەم مەنزڵگایە.

هەر سەرکەوتوو بیت.

د. ئەرسەلان بایز
ئەندامی مەکتەبی سیاسی (ی.ن.ك)
٢٠٠٣/١٠/١٥ سلێمانی

  

ئەوەندەی کوردستان مەڵبەندی ڕاپەڕین و شۆڕش بووە، هێندەش خوێناوی تر نە گەلانی دەوروپشتی لە ناوچەکەداو نە مێژووی قوربانی‌دانی ئەو شۆڕشانەش لە جیهان دا بۆ ڕزگاریی و سەربەخۆیی بە دەردی هاوشێوەی کوردان نەچووە. بەو ئەندازەیەش دوو سەد ساڵەو بزووتنەوەی کوردایەتی سەردەم و قۆناغ و سەدەی لێوان لێو لە کارەسات دەبڕێ و لەو پێناوەش دا گەلەکەی دەریایەك لە خوێن و گەورەترین قوربانی، لە نموونەی باشترین ڕۆڵەکانی ئەبەخشێ. هەروەها یەکێتی ولات و سەروەری خاکەکەی بە ناوەندی دەوڵەتێکی دراوسێوە دەلکێنرێ. گەلێکی وا لە پرۆسەیەکی درێژخایەن دا هەوڵی تواندنەوەی لە ناو بۆتەی دانیشتوانی (عەرەب و فارس و تورك)دا دەدرێ. هەر قۆناغەو بەر شاڵاوی جینۆسایدو ڕەشەکوژی و ئەنفال ئەبێتەوە.

جیۆپۆلەتیکی کوردستان مۆرکێکی دیاری لەسەر هەر سێ قۆناغەکەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بەجێهێشتووە. بەو پێیەش خاکەکەی بووەتە ناوەندێکی وەبەرهێنانی وزە لە دابین کردنی سەرچاوەکانی کەرەستەی خاو بۆ دەوڵەتانی دەوروپشت و جیهان لە سەرێکەوەو ئامادەکردنی وەك سەنتەرێك بۆ گۆڕەپانی کێشەو ململانێ سیاسی‌یەکان لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دا لە سەرێکی ترەوە، بەرئەنجامی ئەو هەموو چارەنووسە ڕەش و دژوارانەی گەلەکەی و جوڵانەوەکانی بووە کە تا ئەمڕۆ کورد بە مافەکانی نەگەیشتووە.

بۆیە قۆناغەکانی شۆڕشی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان لە مێژ ساڵە دیارترین هەژموونی سیاسەتەکانی دەوڵەتانی کۆلۆنیالیزم و وابەستە بە جێبەجێکەری ئامانجەکانی ئەوانەوە، لەسەر دامرکاندنەوەی بزوتنەوە نەتەوایەتی‌یەکانی کورد پێیان داگرتووە. هەروەها جۆری پیلانەکان لەگەڵ فراوان بوونی شۆڕش و ڕاپەڕین و هەڵچوونە جەماوەری‌یەکان دا گەلەکۆمەکی سیاسی و عەسکەری ولاتەکانی ئیقلیمی‌یان لێکەوتۆتەوەو تێکۆشانی گەلی کوردیان لە سەردەمێکی خەبات دا بە هۆی پەلاماردانە چەند قۆڵی‌یەکانیان کپ کردۆتەوە.

لە هەلومەرجی قۆناغی یەکەم دا، بزوتنەوە نەتەوایەتی‌یەکانی کورد فراوانترین حکومەتی خۆماڵی‌یان بە خۆیانەوە بینیوە. چونکە ئەو شۆڕشانەی کەوتبوونە نێوان سەدەو ساڵانی (١٨٠٠- ١٩١٤)وە، زۆرترین ماوەو تەمەنی دەسەڵاتدارێتی، گەورەترین

ناوچەی قەڵەمڕەوی‌و سەرکردایەتی کردن، لێدانی سکەی پارەی تایبەت بە حکومەت، دروست کردنی کارخانەی چەک‌و باروت، بەرهەم هێنانی مووشەک‌و تۆپخانە، پێکەوەنانی زۆرترین ژمارەی لەشکری نیشتمانی، مۆرکردنی (پەیمانی پیرۆن) لە نێوان چەند سەرانی میرنشین بۆ لێدانی دوژمن، تێکشکاندنی لەشکرکێشی‌یەکانی دەوڵەتی (عوسمانی‌و ئینگلیزو فەرەنسا) لەسەر دەستی سوپای ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان، نەبوونی پشتیوانی لە دەرەوە، ئینجا کەم توانایی دەستی داگیرکەران لەسەر کۆنترۆڵ کردنی کوردستان‌و گەلەکەی. تایبەتمەندی ئەو جوڵانەوانەن کە لە سەردەمە جیاجیاکانی (شۆڕشی بابانەکان)و (شۆڕشی نیشتمانی میر بەدرخان لە جزیرەو بۆتان)و (شۆڕشی نەتەوایەتی محەمەد پاشای ڕەواندزی). بە شێوەیەك لە شێوەکان بەری تەقەلاکانی کورد بە ئاکام گەیشتبێ.

هەرچی لە قۆناغی دووەم دا بووە، هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتێکی نەتەوایەتی، کۆڵی بە تێکۆشانی گەل نەداوەو لەو قۆناغەدا کە کەوتبووە نێوان سالانی (١٩١٨- ١٩٣٩)ەوە، ئەگەرچی بزوتنەوەکان بە کەمترین ماوەو لە تەسکترین ناوچەی قەڵەمڕەوی‌دا، کورد لە نێوان یەك هەتا دوو ساڵ دەسەلاتدارێتی بەخۆیەوە بینیوە، بەلام تەمەنی جولانەوەکانی زۆریان نەخایاندووە ڕوبەڕوی سیاسەتەکانی (ئینگلیز)و پیلانی حکومەتەکانی ناوەند بوونەتەوە. لە کاتێك دا لە بەشی باشوورەوە شۆڕشەکانی کەوتنە بەر پیلانگێڕیی ئینگلیزو هاوپەیمانێتی دەوڵەتی ئێران‌و حکومەتی تازە دروست کراوی عێراق. لە بەشی باکورەوە بزوتنەوەو ڕاپەڕینەکانی بەر پەلامارданی دەوڵەتی کەمالیستەکان کەوتن. تەنانەت دەوڵەتی (فەرەنسا)یش ئەو کاتەی کە جڵەوی (سوریا)ی بە دەستەوە بوو ڕێگای‌دا بە لەشکرەکەی (تورکیا) هەتا هێڵی شەمەندەفەری (حەڵەب) بەکاربهێنێ بۆ ئەم جارە لە پشتەوە لە تێکۆشەرانی کورد بدات. بە ڕادەیەك گەلی کوردیان بە دەردی (ئەرمەنی)یەکانی ئەو وڵاتەی تورکیا بردو ئینجا بۆ تورکاندن‌و تواندنەوەی کورد سیاسەتێکی ڕەگەزپەرستی‌یان بۆ ڕاگواستن‌و لەناوبردنی گەلەکەی جێبەجێ‌کرد. لەوانەش هەر تەنها بە هۆی سەرماوسۆڵەی زستانەوە زیاتر لە (نیو ملیۆن) هاوولاتی کوردی ڕاگوێزراو لە خەڵکی ناوچەکانی

(دەرسیم)و (ئارارات) لە ڕێگادا بەرەو باکور بە مەرگ تیا چوون. لەولاشەوە لەشکری تورکیا بەوپەڕی بێ ویژدانی‌یەوە بەری ئەو ئەشکەوتانەیان بەبەرد هەڵدەچنی کە خەڵکی ناوچەکە بۆ خۆشاردنەوە لە ترسی جەندرمەکان ڕوویان تێ کردبوو. بەڵام بێ ئەوەی کەس پێیان بزانێ لەناو برسێتی‌و تینوێتی ئازاریان دەچەشت هەتا دەمردن. هەروەك بەبەرچاوی خەڵکەکەوە بە سەدان ژن‌و منداڵ‌و لاوی کورد دەخرانە ناو گونی‌یەوەو لەپاش ئەوەی سەریان توند شەتەك دەدران، فڕێ دەدرانە ناو دەریاوە. لە نموونەی بزوتنەوەکانی ئەم قۆناغەش، لە بەشی ڕۆژهەلاتەوە ڕاپەڕینە چەکداری‌یەکانی (سمکۆی شکاك)و لە بەشی باشورەوە شۆڕشەکانی (شێخ مەحمودی نەمر)و لە باکورەوە شۆڕش‌و ڕاپەڕینەکانی (شێخ سەعیدی پیران)و (شۆڕشی شاخی ئارارات)و (ڕاپەڕینی ناوچەی دەرسیم) بوون.

بزوتنەوەکانی قۆناغی سێیەم لەناو گەرمەی جەنگی جیهانی دووەم‌و لە سەرەتای جەنگی سارددا دەرکەوتن. لەم قۆناغەدا کە کەوتبووە نێوان سالانی (١٩٤٣– ١٩٩٠)ەوە سەردەمی جولانەوەیەکی نوێی کوردایەتی دەستی پێکردو لە زەمینەی سیاسی جۆراوجۆردا چەندین ڕاپەڕین‌و شۆڕشی نەتەوایەتی هەریەك لە باشورو بەشەکەی ڕۆژهەلاتی کوردستانی گەورەی هەژاند. بەلام لەم قۆناغەدا دوژمنانی کوردو سوپاکانیان بەشێوەیەکی ترسناك‌و لە سەروی پێداویستی‌یەکانی دەوڵەتەوە پەرەیان بە چەك‌و تەکنەلۆجیای عەسکەری‌داو هەرچی ولاتانی زلهێزو بەرهەم هێنەرانی چەك بوون لە ناردنی فڕۆکەی تازەو کۆپتەرو تانك‌و مدەرەعەو ناپاڵم‌و فۆسفۆرو تۆپخانەی دورهاوێژو سەکۆی هەڵدانی ڕۆکێت‌و مووشەکەکانی زەوی بۆ زەوی‌و زاناکانی پسپۆر لە بوارەکانی چەکی کیمیایی خنکێنەرو کاولکاری بۆ داگیرکەرانی کوردستان هیچ درێغی‌یەکیان نەکرد. هەروەها بێجگە لە (کۆمارەکەی مەهاباد) کە حکومەتێکی خۆماڵی لێکەوتەوەو ماوەی کەمتر لە ساڵێ لە تەمەنی بەسەر دەبات، بەلام دوای ئەوە لە حوکمڕانی‌دا هیچ ڕاپەڕین‌و شۆڕشێکی کوردستان لەو جۆرە، تاقی کردنەوەیەك بە خۆیانەوە نابینن‌و لە نێوان هەرەس‌و لاوازکردن دا تواناکانیان دائەمرکێنەوە. هەر لەم قۆناغەش دا چەکی کیمیایی بەشێوەیەکی بەرێلاو لە دژی تێکۆشەران‌و هاوولاتیانی مەدەنی ئەنجام دەدرێ‌و بە دوو کارەساتی نەتەوەیی

له(کیمیابارانی هەڵەبجە)و (ئەنفالەکان)دا کۆتاییان پێ دێ. لە بزوتنەوەکانی ئەم قۆناغەش (حکومەتەکەی کۆماری مەهاباد)و (شۆڕش و بزاڤی ئەیلول)و (شۆڕشی نەتەوایەتی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران)و دواتریش شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بووە.

لە جەنگی سارددا شوێنی کوردستان کەوتبووە نێوان (تیۆرە جیۆپۆلەتیکی یەکان)و ستەمی باڵادەستەکانی هێزو ناوەندەکانی لەت لەتکردنی وڵات و لە یەك ترازاندنی یەکێتی نیشتمانی و سەروەری گەلانی بندەست. ئەو تیۆرانەی کە بە کردەوە جێگای مەبەست بوون لە لایەن ڕۆژئاواوە بۆ گەشەنەکردن و لە قاڵبدانی زیاتری ناوچەی (دڵی زەوی)، واتە ئەو ناوچەیەی کە ناسراو بوو بە (یەکێتی سۆڤیەت)ی جاران. بۆیە شوێنی کوردستان لە سەرەتای سەدەی بیستەم و لە باروودۆخی جەنگی سارددا خۆی لە نێوان تیۆرە جیۆپۆلەتیکی یەکان دا بینی یەوەو لە جاران دژوارتر شکست چاوەڕێی شۆڕش و جوڵانەوەکانی کردووە. چونکە کوردستان ببووە وڵاتێکی بەربەست لە بەرامبەر گەشەنەکردنی وڵاتی سۆڤیەت دا. بۆ نموونە لە تیۆری وشکایی دا بە پێی بیردۆزی (ماکندەر) کوردستانی گەورە لە نێوان (دوو کەوانە)دا کەوتبووە تەنیشت (کەوانەی یەکەمی ناوەوە)، ئەو کەوانەیەی کەوا (دڵی زەوی) ڕاستەوخۆ جیای کردبووەوە لە ناوچەی (دەسەڵاتی ڕۆژئاوا). هەروەها لە تیۆری (دەریایی)دا بە پێی بیردۆزی (ماهان) کە گرنگی بە ناوچە زەریایی و دەریاییەکان دەدا، کوردستانی گەورە لەم تیۆرەدا کەوتبووە سەر (دەریای ناوەڕاست) لە (ئەسکەندەرونە)و دەریای (کەنداوی فارس) لە (لوڕستان). ئەم دوو دەریایەش لە چوارچێوەی ئەو ستراتیژەدا بوو کە ڕۆژئاوا گرنگی پێ دەدا. بەڵام لە تیۆری (ئاسمانی)دا بە پێی بیردۆزی (دسڤرسکی)، کوردستانی گەورە کەوتبووە (ناوچەی چارەنووس)ەوە، ئەو ناوچەیەی کە ململانێی سۆڤیەتی جاران و ئەمریکای لەسەر بووە.

بۆ ئەمەش هەر لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە، وڵاتانی ڕۆژئاواو هاوپەیمانەکانیان چەندین پەیماننامەی ستراتیجی و سەربازی یان بۆ پیادە کردنی تیۆرە جیۆپۆلەتیکی یەکان

ئیمزا کـردووە، لەوانـەش پـەیمانی بـاکوری ئەتڵەسـی (نـاتۆ) سـاڵی (١٩٥٦)و دواتـر پەیماننامەکانی وەك (فەرمۆزا)، سەنتۆ (بەغداد)، سیاتۆو ئەنزۆس) یان بە دوادا هاتووە. بە رادەیەك شوێنیکوردستانی گەورە لەناو ئەم پەیماننامانـەدا بـە ڕوونـی سـاغ ببـووەوە، لـە کـاتێك دا بەشـێکی کوردسـتانی تورکیـا کـەوتبووە بـەر پـەیمانی (نـاتۆ)و بەشـێکی تـری کوردسـتانی عـێراق کـەوتبوە بـەر پـەیمانی (بـەغداد)ەوە. بـەمجۆرە ئەگـەر (کـەمپی سۆشیالیسـت) لـە کۆتـایی هەشـتاکان دا تێـك نەچووبایـە، ئـەو کاتـە بـاری جیۆپۆلـەتیکی کوردستانی گەورە هەروا دەمایەوە کە لە سالانی جەنگی ساردا گەلەکەی ژیانیـان بەسـەر دەبرد.

بۆیە هەرچی دابەش کردنو لەبەر یەك ترازاندنی سنورەکانی کوردستان بووە، هەمیشـە لەسەر دەستی بڕیاریەدەستو هێزە فراوان خوازەکانی نێودەوڵەتی ئـەنجام دراون.هـەر لـە ئەنجامی ئەو دابەش کردنەش دا کە لـە نێـوان (ئینگلـیزو فەرەنسـاو ڕوسـیا) بـەڕێوەچوو، نیشتمانو گەلی کوردستانیان لەیەك جیا کردەوەو بەسەر مۆدێلی ناوچەی (سور)و ناوچەی (شین)دا ناوزەدیان کرد. لە پـای ئـەوەش دا شـوێنی کوردسـتان بووەتـە مـەیدانی جـەنگو زەمینەی دابەش کردنی بەرژەوەندییە سـتراتیژەکانو بنکـەی تـاقی کردنـەوەی تـازەترین چەكو لەبارترین وێستگەی شەڕو پێکادانی نێـوان ڕۆژهـەلاتو ڕۆژئـاوا بـووە. لەبەرامبـەردا گەلێکی زۆر لێکراو، بێچارە دەستیان داوەتەچەكو بێوچان هەوڵیان داوە بۆ دەرپـەڕاندنی داگیرکەرانی مێژوو. بەمەش فاکتەری دەرەوە بەردەوام یەکێك بووە لەو هۆکارانەی ڕێگر لە پێکەوەنانی دەوڵەتێکی نیشتمانی یەکگرتوودا.

لە ڕووی مـافی مرۆڤـەوە، کـورد نـە لـە (قۆنـاغی دەسـتوریی)و پەرلـەمانی سـەر بـە حکومەتەکانی وابەستەو نە لەسەردەمی (یاساکانی نێودەوڵـەتی)دا بـە ئامانجـەکانی خـۆی شـاد نەبووەتـەوە. هەرچـەندە ئـەو وڵاتانـەش کـە بەشـێك لـە کوردسـتانیان بەرکـەوتووە، هـەندێ جـار لـە ژێـر گوشـاری بزووتنـەوەو ڕاپەڕینـەکانی کـورددا، دەسـتی گۆڕانکارییـان خسـتۆتە نـاو دەسـتوری وڵاتـەکانیانو بـەبیانووی چارەسـەکردنی کێشـە ڕەواکـانی کـورد ئامادەبوونی خۆیان لەم ڕووەوە دەربڕیوەو بۆ ئەم مەبەستەیش بەڵێنو پەیمانی درۆیان بە

سەرانی شۆڕش و جولانەوەکانی داوە. بەلام لە باروبۆخی وەرچەرخانی ڕەوشەکەو پەیداکردنی هێزدا، هەرزوو پەشیمان بوونەتەوە. دواتریش نەڕێکخراوی (کۆمەڵەی گەلان) بەمەبەستی دابین کردنی مافی مرۆڤ و جێگیرکردنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لە سالانی (١٩١٩- ١٩٣٩)و نە جێگرەوەی بە ڕێکخراوی (نەتەوەیەکگرتووەکان) بۆ تەواو کردنی ئەو دوای هەنگاوەکانی کۆمەڵەی گەلان لە ساڵی (١٩٤٥) بە مەرجی جارنامەی گەردونی بۆ مافەکانی مرۆڤ و هەروا پەسەند کردنی ڕاگەیەندراوی سەربەخۆیی بۆ ولاتان و گەلانی بندەست. یەکێك لە داخوازییەکانی کوردی لە پارچە پارچەیی یەکلایی نەکردەوە، بۆ هەڵبژاردنی شێوە ژیانی بێ ستەم و چەوسانەوە، لە دەستەبەرکردنی مافی چارەی خۆنووسین دا.

ئەو ڕۆژگارەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بلێسەی ئاگرە خەفەکراوەکەی بزوتنەوەی کوردایەتی جۆشدایەوە، سەردەمێك بوو بۆ جوولانەوەی کورد نائومێدی و شکستی ئاواتەکان بوو، بۆ شۆڕشی مەشخەلانی نوێ هەڵبژاردنی ڕێگایەکی سەخت و بەرزکردنەوەی پەیامی نەسرەوتن هەتا سەرکەوتن بوو، بۆ سەرانی بەعسیش ڕێکخستنی ئاهەنگی خۆشی و ڕازاندنەوەی کۆڕی نان خواردن و مێزی خواردنەوە بوو، ئەمەش چ جای ئەوەی..

لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی:-

جەنگی سەرمایەداری و سۆشیالیستی لە لوتکەدا بوو. بە کردەوەش هەر دوولا لەسەر بنەمای سەرکوت کردنی گەلان و پێشێل کردنی مافەکان و دەست لەسەر پشت دانی سەرانی ڕەگەزپەرست و دیکتاتۆرەکان ڕەفتاریان دەکرد. بۆیە سەرهەڵدانی هەر جولانەوەیەك لەژێر ناوی شۆڕش و بانگەشەی سەربەخۆییدا لەگەڵ ستراتیژ و پەیڕەوی ناوخۆی هەردوو کامپەکەدا یەکیان نەدەگرتەوە.

لەسەر ئاستی هەرێمیدا:-

ئەو ناوەندانەی کە کێشەی کوردیان لە هەموو پارچەیەك دا بە هەڕەشە لەسەر ئاسایشی دەوڵەتەکانیان زانیوە، ڕێکەوتبوون لەسەر پیادەکردنی سیاسەتێکی توندوتۆڵ بۆ لەیەکتر گەیشتن و هاوکاری کردنی لۆجیستیکی لەمەڕ پاراستنی سنوری هاوبەش و

بەرگریی سوپایی‌و ئەمنی، لەسەر لێدانی هەر بزوتنەوەیەکی سیاسی‌و گروپێکی چەکدار لە ناوچەکەداو هەروەها پەیوەندی کردنی بەردەوام لەسەر گوڕینەوەی زانیاری‌و دەست نیشان کردنی جموجۆڵی یاخی بووان لەکاتی خۆیدا. لەپاڵ قەدەغەکردنی هاووڵاتیان‌و خەڵکانی ناوچە سنوورییەکان لە پەڕینەوەو بەزاندنی هێڵە دەست کردەکان‌و چەك داماڵینی گوندنشینەکان‌و گرتنی تێکۆشەران‌و سنورداش کردنەوەیان، گرنگترین هاوپەیمانی ئەو کاتەی ڕژێمی عێراق‌و، حکومەتی ئێران بووە.

**لەسەر ئاستی نەتەوەیی‌دا:-**

گەلی کوردستان ڕوبەڕوی کارەساتێکی گەورەی نەتەوایەتی ببووەوە. لەسەرێکەوە جوڵانەوە دێرینەکەی لە پاش ڕەنجی چواردە ساڵ لە تەمەنی، بڵاوەی لێ کراو بۆ دواتریش دەستی داگیرکەری لە زیاتر کۆنترۆڵ کردنی کوردستان‌و جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی (تعریب‌و ترحیل‌و تبعیث) ئاوەڵا کردەوە، لەسەرێکی ترەوەش پێشمەرگەکانی گەل دوچاری تاڵاوترین نووشستی‌و سەرگەردانی بە کۆمەڵ هاتن‌و لە دژوارترین باری دەرونی‌و ویژدانی‌دا ئەتلانەوە. سەرەڕای سەرهەڵدانی چەندین دیاردەی دزێوی وەك ئەنجام دانی خۆکوژی، پەنابردن بۆ یەکێك لە وڵاتەکانی دەرەوە، ڕۆیشتنەوە بە ناچاری بۆباوەشی بەعس‌و نائومێد بوون لە پاشەڕۆژی کوردو جوڵانەوەی نوێ، زۆرترین ڕێگای هات‌و نەهات گیرابوونە بەر.

شۆڕشی مەشخەڵانی نوێی کوردستان، بەرهەمی تاقی‌کردنەوەی ئەو ساڵانەی شۆڕشە کە بە بازووی هەزاران لە تێکۆشەرو گیان لەسەردەستەکانی پێشەوەی لە شاخ‌و گوندو شارەکان دا مێژووی تازەی بزوتنەوە ئازادیخوازەکەی گەلی کوردیان بەخوێن‌و قوربانی سەروماڵ نووسیوەتەوە. ئەو سەوەرییانەی کە یەك یەك لەناو شیرینی‌و تاڵی ڕوداوەکانی‌ا تەمەنی پێشمەرگایەتیم تیایان دا بڕیوە، یان لە نزیکەوە ئاگاداری ڕودانی وردەکاریەکانیان بووم. ئیتر هەر لەو کاتەوە لە مەفرەزەکەی (مامەڕیشە) بە پێشمەرگە دامەزراوم، ساڵی (١٩٨١) لەسەر داواکاری هەرێمی (٥)ی قەرەداغ نێردراوم بۆ خولی شەهید (جەمالی عەلی باپیر) لە سەرکردایەتی‌و ئینجا لەسەر خواستی (مەکتەبی عەسکەری) گواستراومەتەوە بۆ

کەرتی (ئێستگەی دەنگی گەلی کوردستان) لە (تەوێڵە) کە ئەو کات هەڤاڵ (ئەرسەلان باین) لێپرسراوی دەزگای ڕاگەیاندنی (ی.ن.ك) بوو. هەروەها لە ناوەندی (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان)و لە (تیپی تایبەتی مەڵبەندی یەك)و دواتریان لەسەر دەستەکەی فەرماندەی شەهید (مەلا ئەحمەد) لە تیپی (٥٥)ی قەرەداغ بووم. بە درێژایی ئەو ساڵانەش هەرچی بە تێکەڵاوبوون لەگەڵ پێکهاتەی هێزەکانی ئەوسای هەرێمەکانو لە پاشان لە مەڵبەندەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان، یان بۆ ئەنجام دانی هەر چالاکییەکی پێشمەرگانە، سەرجەم سنورەکانی ﴿کەرتی (٤)ی جەباری، ناوچەکانی زەنگنە، پێدەشتەکانی سنوری چالاکییەکانی (٥١)ی گەرمیان، تیپی (٥٣)ی شێروانە، سنورەکانی قەرەداغ، بازیان، سورداش، دۆڵەڕوت، دۆڵی جافەتی، هەرێمی (٢)ی ئەوساو لە پاشان تیپی (٢١)ی کەرکوك، خاڵخاڵان. سەرکردایەتی لەخڕێ ناوزەنگو توژەڵەو زەڵێو باوزێ شەڕەکانی هێزی پشتیوان، سنوری ناوچەکانی مەڵبەندی (٣)، قەڵاتووکان، وەرتێ، قرناقاو پشت ئاشان. دەشتەکانی کۆیە، سەرکردایەتی لە سەرگەڵوو بەرگەڵوو، بناری ئاسۆس، ئاوەژێ، دەشتەکانی مەرگە، سنورەکانی قەیوان، سیتەك، چوارتا، بێژوێ، بێوران، بێتووش، سنوری ناوچەکانی دەشتی شارەزور، شەڕی ڕزگارکردنی هەڵەبجەو کیمیاباران کردنی. کیمیابارانی گۆپ تەپەی ئاغجەلەر، دۆزەخی ئەنفالی (٤)، پاشەکشەی هێزەکانی پێشمەرگە بۆ بناری قەندیل.﴾ لەناو شەڕو کارەساتو ڕوداوەکانی ئەو ڕۆژگارەو ئەو ناوچانەدا بوومو لە پاشان ئەم لێکۆڵینەوەیە بوون بەسەرچاوەی نووسینەوەو لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەو ساڵانەی شۆڕش کە تیایان دا یەکێتی نیشتمانی کوردستانو گەلی کوردستان لە سەختترینو درەوشاوەترین ساڵانی دەیەی هەشتاکان دا ڕۆڵی نیشتمانیو نەتەوەیی خۆیان تیا بەرجەستە کرد.

  

## ١/ له ڕووی سیاسی‌یه‌وه.

هه‌لومه‌رجی ڕووداوه‌كانی پاش ٢٠/ی ئازاری/ ١٩٧٥ ته‌نگژه‌یه‌كی سیاسی‌و پێشمه‌رگه‌یی‌و ڕێكخراوه‌یی بۆ بزوتنه‌وه‌ی كوردایه‌تی‌و سه‌رده‌مه‌كه‌ی هێنایه پێشه‌وه تاوه‌كوو قۆناغێكی نوێ له جولانه‌وه‌ی كورد ده‌ست پێبكات‌و سه‌روكاری سه‌خترین‌و دژوارترین ئه‌زموونی تازه‌ی شۆڕشی كوردستان له ئه‌ستۆ بگرێ. به‌و ئاقاره‌ش دا له ماوه‌ی كه‌متر له (٢) مانگ‌و نیو به پێی گه‌لاڵه‌نامه‌یه‌ك له زنجیره‌ی ئاماده‌كاری‌یه‌كانی كۆمیته‌ی سه‌ركردایه‌تی یه‌كێتی نیشتمانی كوردستان له ده‌ره‌وه، یه‌كه‌مین به‌یاننامه‌ی دامه‌زراندنی له ١٩٧٥/٥/٢٢ به زمانی عه‌ره‌بی‌و دواتر له ١٩٧٥/٦/١ به زمانی ئینگلیزی‌و ئه‌ڵمانی بڵاوكرده‌وه. ده‌سته‌ی دامه‌زرێنه‌ر بریتی بوون له (مام جه‌لال، نه‌وشیروان مسته‌فا ئه‌مین، دكتۆر كه‌مال فوئاد، دكتۆر فوئاد مه‌عسوم، عادل موراد، عه‌بدول ڕه‌زاق فه‌یلی، عومه‌ر شێخ مووس.) ئیتر له‌و كاته‌وه كار بۆ دانانی پرۆژه‌ی ئامانجه دوورو نزیكه‌كانی شۆڕش كراو نه‌خشه‌ی ڕزگاریش ئه‌و ڕه‌هه‌ندانه‌ی بۆ ده‌ست پێكردنه‌وه‌ی خه‌بات‌و شۆڕشی چه‌كداری خسته ڕوو كه چۆن هێزه‌كانی پێشمه‌رگه له دواین وێستگه‌ی چالاكی‌یه‌كانیان دا شۆڕشی شاخ به شۆڕش‌و ڕاپه‌ڕینێكی سه‌رتانسه‌ری جه‌ماوه‌ریی ببه‌ستنه‌وه.

ئه‌گه‌ر له سیاسه‌ت دا زه‌مینه‌ی له دایك بوونی (ی.ن.ك) هی پێداویستی‌یه‌كانی گه‌لێكی ئازادو ده‌ستڕۆیشتوو بوایه، خه‌می ته‌نها ده‌سته‌به‌ر كردنی دیموكراسی‌وپێشخستنی مافی مرۆڤ بوایه، ئه‌و كاته‌ش بێ هیچ گومان شۆڕشی چه‌كداری‌و توندوتیژی سه‌ربازی ڕه‌ت ده‌كرده‌وه‌و له سه‌ره‌تاترین ده‌سپێكی هه‌نگاوه‌كانی‌دا ڕووی له هه‌ڵگیرساندنه‌وه‌ی جه‌نگی پارتیزانی نه‌ئه‌كرده‌وه، به‌ڵكوو له ده‌رگایه‌كی تروبه ئاماده‌بوونێكی تره‌وه ده‌هاته پێشه‌وه‌و به ژماره‌یه‌ك ڕیفۆرمی چاكسازی‌وپرۆژه‌ی تازه‌وه خۆی ڕاده‌گه‌یاند. چونكه له سایه‌ی ده‌وڵه‌تێكی دیكتاتۆری‌دا كه سیسته‌مه باوه‌كه‌ی له‌سه‌ر بنه‌مای زه‌برووزه‌نگ‌و ناوه‌ندێتی توندوتۆڵ‌و تاك حزبی سه‌رچاوه‌یان گرتووه‌و یاساكانی حوكم‌و ده‌سه‌ڵات له

نوقمی تاوان دا بەرێوە دەبات، چ جای لە دایك بوونی ڕێكخراوێكی بەرهەڵستكار لە پرۆژەو بەرنامەدا كە هەرگیز لەگەڵ سادەترین كردەوەو ڕەفتارەكانیدا یەك ناگرێتەوە، پیرۆزیو ڕەوایی بە شۆڕشێكی ڕاگەیەندراو دەبەخشێ.

یەكێتی بەیاننامەكەی، ڕژێمی نیگەران كردو لە بەرامبەر زەنگێكی ناوەخت دا بەرگری عێراقی لە دۆخێكی ئاساییەوە بەرەو ئاڵۆزی كەشی سەربازیو ڕێكخستنەوەی سوپاو هێزی ئامادەباشی شپرزە كرد. لە دەرەوەش هانای بردە بەر شای ئێرانو دەوڵەتی كەمالیستی تورك، هەتا لە گێژەنگی قەیرانە نوێیەكەیدا بەشداری بكەنو لە پەلاماردانو لەشكركێشی هێزەكانیان بۆ سەر جوڵانەوەكە دریغی نەكەن. یان ئەوەتا لە ڕووی چاودێری سنورییەوە زانیاری ئەمنی لە كاتی خۆیداو لە لایەن هەردوو لاوە پێشكەش بە وڵاتەكەی بكەن.

زۆری نەخایاند نموونەی باشترین كۆمەكی ئێران بریتی بوو لە دەسگیركردنی ژمارەیەك لە پێشمەرگەو ئەندامانی سەركردایەتی یەكێتی لەسەر سنور كە پاشان بە حكومەتی عێراق تەسلیم كرانەوە. هەروەها ساڵی (١٩٧٨) بە هاوپەیمانی سێ قۆڵی عێراقو ئێرانو توركیا لە سنوری (هەكاری) نزیكەی یەك هەزار پێشمەرگەی یەكێتی نیشتمانی كوردستانیان شەهیدو بریندارو دیل كرد. ڕەنگە ئەم هاوپەیمانییەش هەروا بە ئاسانی تێك نەچوویایە ئەگەر ڕاپەڕینی خەڵكی ئێران ساڵی (١٩٧٩) لە دژی حوكمڕانی پەهلەوی بەرپا نەبوایە، كە دواتر شكستی بە ڕێكەوتننامەكەی (جەزائیر) هێناو بووە پایەیەكی گرنگیش بۆ هەڵگیرساندنی شەڕی عێراق- ئێران لە ساڵی (١٩٨٠)دا. بە جۆرێ هاوپەیمانییەكەش لە بنجو بناوانەوە هەڵتەكێنیو هەلومەرجی تازەش لە بەردەم ڕاپەڕینی گەلی كوردستان باشتر بڕەخسێنێ.

لە ڕووی پشتیوانی دەركییەوە، هەڵگرانی مەشخەڵ لەوپەڕی بێ دالدەییو لالێكردنەوەی ناوچەییدا بوون. لەم پێناوەشدا كۆمیتەی سەركردایەتی لە هەوڵی دامەزراندنی ئەو ڕایەڵانەی پەیوەندییانە بووە كە لەگەڵ نەیارانی دەوڵەتی عێراق بنیات بنێ، بە تایبەتی ئەوانەی كە ململانێی مێژووییان هەبووە لە دژی دەسەڵاتدارانی بەعس،

بەڵکوو لەو ڕێگایانەوە بتوانرێ هەم دەرفەتی ڕەخسێنراوی دوژمنی ناوەندی دوژمنەکەیان بکەن بە ئامرازی چەترێکی سیاسیو جۆرێك لە هاریکاریی دەرەکیو دۆستایەتی هەرێمیو ستراتیجی لە ڕووی بەدەستهێنانی کۆمەکی سەربازییەوە بۆ شۆڕشە ئازادیخوازەکەی گەلی کوردستان مسۆگەر بکات، هەمیش بۆ ئەوەی مەودای پردێکی گەیاندن بێت لەسەر گواستنەوەی ئێشو ئازارەکانی نەتەوەیەك بە وڵاتانی دەورووپشتو دونیا، کە کێشە ناوخۆییەکەی بکات بە کێشەیەکی کاریگەری نێودەوڵەتیو جیهانی ئەمڕۆی لێ ئاگادار بکرێتەوە.

شۆڕشی مەشخەڵان، سەرلەنوێ داڕشتنەوەی بیری سیاسی کورد بوو لە سەرکردایەتی کردنو شێوەی ئاراستەکردنو تەرزی ئایدیۆلۆجیو فرەڕێکخراوەییو بەگەڕخستنو ڕێبەرایەتی بەکۆمەڵو سەکۆی جیاجیاو کراوە بە ڕووی ئایندەو نەگۆڕ لەسەر ستراتیژو جێبەجێکردنی بەرنامەکانو سووربوون لەسەر سازش نەکردنو پێداگرتن لەسەر داواکارییەکانو پرۆژەی مافی چارەی خۆنووسین. بە کردەوەش گواستنەوەو کارپێکردنی پرسکەیو گەیاندنی کێشەو مەینەتییەکانی بە ڕای گشتیو ناوەندەکانی بڕیار بە دەستی جیهان لە دەرەوە. هەروەها بە سازدانو ڕێکخستنی جەماوەرو کۆکردنەوەی تواناکانو گەشەپێدانیان لەناو یەکێتییەکی ویژدانیدا. کە نە جیابوونەوەی باڵێکی ڕێکخستن لە ڕێکخراوە گەورەکەو نەدابەش بوونی سەرکردایەتیەکەی بۆ چەند ناوچەو مەڵبەندێکی پێشمەرگایەتیو نە لە ئاکامی بەستنی کۆنفرانسو کۆبوونەوە فراوانەکان لەو ڕۆژگارەدا، نەیانتوانی، تەنانەت ئەڵقەی بازنەیەك لە تۆکمەیی ڕیزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بگۆڕن، یان ڕێڕەوی سیاسەتەکانی بەرەو هەڵدێران بەرن.

فرەڕێکخراوەیی بە کردەوە پیادەی ئەزموونی سۆشیال دیموکراتەکان بوو. وەك ئەوان چۆن لە کاروانە پڕ لە داهێنانەکانیان دا سەرەنجام بوون بە ڕێکخراوی تێکڕای چینو توێژەکان لە یەکێتییەکی ئۆرگانیدا، ئەوساکەش هەنگاوەکانیان بەرەو سەکۆی جیاجیاو فرەبواری ڕیفۆرمی جیاجیا هەڵگرت. هەر ئاوهاش یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەناو شۆڕشە ڕزگاریخوازەکەی گەلی کوردستان دا بڕیاری دا بوو ڕێکخستنی بەرفراوان لەم سەری

ڕاستەوە بۆ ئەو سەری چەپ لەناو ڕیزەکانیدا لەخۆ بگریٚ. تاوەکوو بەزووترین خێرایی شۆڕشەکە بەجەماوەریی بکریٚو لە خەبات دا ڕۆڵی شانازی چینێکی دیاریکراو بەسەر بەشداری ئەودوای چینو توێژەکان دا نەسەپێنریٚ. بۆیە سەرانی شۆڕش پێیان لەسەر ئەوە داگرت کە دەبیٚ هەموو نیشتمان پەروەرانی کورد لەناو ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)دا ڕێك بخریٚن، بەڵکوو لە پاشەڕۆژدا ببن بە هەوێن بۆ ڕاپەڕینی سەرتاسەری کۆمەڵانی خەڵك لە کوردستان دا.

ئەو ڕێکخراوانەش لە بەرەی هاوپەیمانێتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دا بوون لە (٣) باڵی ڕێکخستن پێکهاتبوون بەم شێوەیە:-

١/ ڕێکخراوی (کۆمەڵەی مارکسی- لینینی کوردستان). ئەم ڕێکخراوە لە ١٩٧٠/٦/١٠ دامەزراوە، ئەگەرچی بە درێژایی ئەو قۆناغە گرنگی بە چالاکی ڕێکخستن داوەو خۆی ئاشکرا نەکردووە، بەڵام بە هۆی هاوپەیمانێتییەکەی لەناو یەکێتی نیشتمانی کوردستان دا ئەستێرەی درەوشاوەی بەرەو ئاسۆی ڕوون هەڵکشاوەو لە ١٩٧٩/٥/١یش بڕیار دراوە لەسەر گۆڕینی ناوەکەی بە (کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستان).

٢/ ڕێکخراوی (بزوتنەوەی سۆشیالیستی کوردستان). بەشێکی ئەم ڕێکخراوە لە مانگی (٣)ی ساڵی (١٩٧٩)دا لە هاوپەیمانێتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان دوورکەوتەوە.

٣/ ڕێکخراوی (هێڵی گشتی). ئەم دوو ڕێکخراوەی دوایی لە کۆبوونەوەی فراوانی ١٩٨٣/٨/١٥دا بڕیاریان دا ڕێکخستنەکانیان تێکەڵاوی یەکتری بکەن بە ناوی (یەکێتی شۆڕشگێڕانی کوردستان)ەوە.

هەر ڕێکخراوێکیش بەجیا لەوی تر کۆنفرانسو کۆبوونەوەی فراوانی خۆی لەسەر داوای ئەندامو کادرە پێشکەوتووەکانی دەبەست بە ئامانجی گەشەپێدانی بواری ڕێکخراوەییو دیاریکردنی بەرنامەو پرۆژەی تایبەتی نوێ لەسەر چارەسەرکردنی کێشە نەتەوایەتییەکانی کورد لە کوردستانی عێراق دا.

سەکۆی جیاجیاش یەکێك لە بنەماکانی پرۆسەی دیموکراسی بە شێنەیی دارشتو سیستەمی تاکرەویو دەمارگیری حزبی هەڵوەشاندەوە. لە کاتێکدا یەکێتی نیشتمانی

کوردستان له هەموو بانگەشەکانی‌دا به پێویستی زانیوه که هەموو پارت‌و گروپه ڕاست‌و چەپەکان لەبەرەیەکی بەرفراوان دا کۆببنەوەو له ئایندەش دا به هەموو لایەك جڵەوی دەسەڵات بەڕێوەبەرن، که هەم عێراق بەرەو دیموکراتی‌و فرەحزبی‌و دادوەری کۆمەڵایەتی بەرن‌و وڵاتەکه له مەترسی دیکتاتۆری‌و زەبروزەنگی سەربازی بەعس پاك بکەنەوە، هەمیش کوردستان لەژێر چەکمەی داگیرکردن‌و جەوری نەتەوایەتی ڕزگار بکەن‌و گەلەکەیشی به مافەکانی خۆی ئاشنا بێتەوە. بۆیه هاوپەیمانی‌یەك لەسەر بنەمای یەکێتی خەبات‌و شۆڕش له نێوان هێزه کوردستانی‌و ئۆپۆزسیۆنەکانی عەرەب دا له پێناوی دەستەبەرکردنی مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کوردستان‌و مسۆگەرکردنی ئازادی‌و سەربەخۆیی بۆ هاووڵاتیانی عەرەب‌و تورکمان‌و کلدۆ- ئاشوری لەسەر خاکی عێراق دا، یەکێك بووه له ئامانجه پیرۆزو باڵاکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان له ڕۆژی دامەزراندنیەوە.

پرۆژەی بەرنامەو ئامانجه دوورو نزیکەکانی شۆڕش، دەیان دەسکەوتی سیاسی‌و نەتەوەیی‌و نیشتمانی‌و هەرێمی‌و کۆمەڵایەتی‌یان لەخۆ گرتبوو که هەریەکێکیان بەجیا لەوی تر لەچەند پێناسەو شیکردنەوەیەکی بابەتی‌دا ڕوون کرابوونەوەو له پاش پەسەند کردنیان له لایەن ئەندامانی دەستەی دامەزرێنەرەوە له ئەیلولی ساڵی (١٩٧٦)دا بڵاودەکرێتەوە. که تیایدا هاتووە:- یەکێتی نیشتمانی کوردستان خەبات ئەکات بۆ..

یەکەم/ عێراقی دیموکرات.

أ/ ڕزگارکردنی عێراق له کۆت‌و زنجیرو پەیوەندی‌یەکانی کۆلۆنیالیزمی نوێ‌و له ڕژێمی دیکتاتۆری دوژمن به گەل‌و هێنانه سەرکاری حکومەتێکی دیموکراتی ئیئتیلافی له نوێنەرایەتی پارته سیاسیه پێشکەوتووەکان‌و چینەکانی گەل‌و نەتەوه سەرەکی‌و بچووکەکانی عێراق، تا وڵات له ماوەیەکی کورت دا بگوێزرێتەوه ژیانێکی ئاسایی دیموکرات، که هەموو سەربەستی‌یه دیموکراتی‌یەکان بۆ گەل دابین بکا:- (سەربەستی

هەڵبژاردن، نووسین، فەرهەنگ، دامەزراندنی پارتی، نەقابە، کۆمەڵەی جوتیاران، ڕێکخراوە دیموکراتیەکانی لاوان، قوتابیان، مامۆستایان، ئافرەتان، مافی کۆبوونـەوە، خۆپیشـاندان‌و مانگرتن).

ب/ پێکهێنانی ئەنجومەنێکی نیشتمانی لە ڕێگەی هەڵبژاردنی ئازادو ڕاستەوخۆو نهێنی‌یەوە لە لایەن کۆمەڵانی خەڵکی عێراقەوە بۆ دانانی دەستوری وڵات‌و داڕشـتنی بناغـەی حوکمـی دیموکراتی‌و سەلماندنی ئۆتۆنۆمی.

ج/ بەشداریبوونی کوردو نەتەوە بچوکەکان لە ئۆرگانە ناوەندی‌یەکان دا بە پێی ژمارەیان.

د/ گەڕاندنەوەی دانیشتوانی ئەسڵی ئەو ناوچانەی لە شوێنەکانی خۆیان بەزۆر دەرکراون.

هـ/ بەرەڵاکردنی هەموو گیراوە سیاسی‌یەکان‌و گێڕانەوەیان لەگـەڵ هـەموو ئەوانـەی لەسـەر بیروباوەڕی پێشکەوتووانە لەکار دەرکراون بۆ سەر کاروفەرمانەکانی خۆیان.

و/ لابردنی هەموو ئەو یاسایانەی بە گیانی فاشیستی‌و بیروباوەڕی کۆنەپەرستانە دانراون‌و، هەڵوەشاندنەوەی هەموو ئەو ڕێکەوتنە ناودەوڵەتی‌یانەی کە بە پێچەوانەی قازانجی گەلەوە کراون.

ز/ هەڵبژاردنی شارەوانی‌یەکان‌و دەزگاکانی بەڕێوەبردن، ڕاستەوخۆ لەلایەن هاووڵاتیانەوە.

<u>دووەم/ کوردستانی ئۆتۆنۆم.</u>

أ/ پێکهێنانی هەرێمی کوردستانی ئۆتۆنۆم لە ناوچەکانی:- (شەنگار، زمار، سمێل، دهۆك، شێخان، تلکیـف، بەعشـیقە، لیواکـانی هـەولێر، کـەرکوك، سـلێمانی‌و قـەزاکانی خانـەقین‌و مەندەلی).

ب/ دەزگاکانی ئۆتۆنۆمـی جگـە لـە کاروبـاری پاراسـتنی وڵات، پەیوەندی‌یـەکانی دەرەوە، دارایی گشتی کە بەدەس دەزگای ناوەندی‌یەوە دەبن، هەموو دەسەڵاتێکی تری ئەبێ.

ج/ دەزگای ئۆتۆنۆمی ئازادی‌یە دیموکراتیەکان بۆ گەل دابین ئەکات.

د/ دانیشتوانی کوردسـتان لـە (١٨) سـاڵی‌یەوە بـەرەو ژوور بـە ڕێگەیـەکی ئـازادو نـهێنی‌و ڕاستەوخۆ ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان هەڵ ئەبژێرن.

هـ/ ئەنجومەنی نیشتمانی کوردسـتان دەزگایـەکی بـەڕێوەبردن بـۆ هەڵسـوڕاندنی کاروبـاری هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردستان هەڵ ئەبژێرێ‌و باوەڕی ئەداتێ یان لێی ئەسێنێتەوە.

و/ هێزەکانی پۆلیس، ئەمن، پاسەوانی سنورو پێشمەرگە، ئەبەسترێن بە دەزگای بەڕێوەبردنی ئۆتۆنۆمییەوە.

ز/ بودجەی ئۆتۆنۆمی پێك دێ لە باجە ناوچەییەکانو دەرامەتی پرۆژەکانی ئابوری تایبەتی هەرێمەکەو ئەو بەشەی بودجەی گشتی عێراق کە بە پێی ژمارەی دانیشتوانی هەرێمی ئۆتۆنۆمی لەچاو هی هەموو عێراق دا دیاری ئەکرێت.

ح/ تەئمین کردنی ژیانی خێزانی شەهیدو پەککەوتەو لێقەوماوانی شۆڕشی کوردستانو پاراستنی مافەکانی ئەوانو هەموو ئەوانەی بەشداری شۆڕش ئەبنو زەرەریان لێ ئەکەوێ.

ط/ هەموو کوردێکی نیشتمان پەروەر بۆی هەیە بێتە هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردستانەوەو کار بکات.

<u>سێیەم/ مافی ئاسوری، تورکمانو کلدان.</u>

أ/ بۆ ئەوەی لە ناو چوارچێوەی کوردستانی ئۆتۆنۆم دا سەریەستی بەکارهێنانو گەشەپێدانی مافی نەتەوەییو فەرهەنگی ئاسوری، تورکمان، کلدان تەئمین بکرێ بە پێی ژمارەیان لە چاو دانیشتوانی هەرێمەکەدا نوێنەریان ئەبێ لە ئەنجومەنی نیشتمانیو دەزگای بەڕێوەبردنی کوردستان دا.

ب/ لەو شوێنانەدا کە زۆرایەتی دانیشتوانن مافی دامەزراندنی دەزگای تایبەتی خۆبەڕێوەبردنیان هەبێ.

ج/ هەموو ئەوانەی دەربەدەرکراون مافی گەڕانەوەیان هەبێ بۆ هەرێمی کوردستان.

<u>چوارەم/ گەشەپێدانی لادێ.</u>

أ/ چاککردنی بنەڕەتی کشتوکاڵ بە پشت بەستن بە جەماوەری جوتیاران بە جۆرێکی ئەوتۆ کە ڕەگو ریشەی پەیوەندییە دەرەبەگیو خێڵەکییەکان دەربهێنێو ئەرزو ئازادی بۆ جوتیاران تەئمین بکاو ببێتە هۆی خەملێنو گەشەکردنی لادێو ژیانی لادێیەکان بە ماکینەکردنی کشتوکاڵو پرۆژەکانی ئاودان.

ب/ دامەزراندنی ئاوایی کشتوکاڵی، ئاژەڵی، پیشەسازی بۆ دروست کردنی مەڵبەندی ئاوەدانو عەسریی ژیان بە کۆکردنەوەی چەند گوندێکی بچووك، وە یان دانیشتوانی ناوچەیەك لە دەوری پرۆژەیەکی سەرەکی.

ج/ باشکردنی ژیانی شوانو گاوانو خاوەن ئاژەڵەکانو پاراستنو پەروەردەکردنو گەشەپێدانی ئاژەڵو دیاری کردنی شوێنی کۆکردنەوەو لەوەڕاندنیان، چاکردنی چۆنایەتیو زۆرکردنیان، وە دامەزراندنی پیشەسازی ئاژەڵیو پەرەپێدانی خزمەتی بەیتاڵی.

د/ دانانی پلانێکی درێژخایەن بۆ نوێکردنەوەی گوندو شارۆچکەکانی کوردستان بەشێوەیەکی وا کە لەگەڵ پێویستییەکانی ژیانی مرۆڤی ئەم سەردەمەو تەئمین کردنی خانوویەرە بۆ هەمو کەسو جوانی سروشتو ئاوو هەوای کوردستان بگونجێ.

ه/ بەستنی گوندو شارەکانی کوردستان بە یەکترییەوە لە ڕێگەی دروست کردنی تۆڕی ڕێگاوبانی ئاسنو ئاسفالتو ڕێگەی هەواییەوە.

<u>پێنجەم/ بەدەست هێنانو چەسپاندنو گەشەپێدانی سەربەخۆیی ئابوری نیشتمانی.</u>

أ/ بە تەواوی ڕزگارکردنی سامانی پەترۆڵی عێراق لە چنگ کۆمپانیا ئیمپریالیستەکان بە هەڵهێنجانو پاڵاوتنو گواستنەوەو فرۆشتنەوە، دامەزراندنی پیشەسازی پیترۆ-کیمیاویو پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی نیشتمانی دوربین لە هەڵهێنجانو فرۆشتنی پەترۆڵدا کە بە تەواوی بگونجێ لەگەڵ نەخشەی درێژخایەنی گەشەپێدانی ئابوریو کۆمەڵایەتیو فەرهەنگیدا.

ب/ نەتەوەیی کردنی بازرگانی دەرەوەو چاودێری کردنی بازرگانی ناوەوەی وڵاتو گەشەپێدانی دەزگاکانی بەشی گشتی.

ج/ گەشەپێدانو فراوان کردنی بەشی گشتی لە پیشەسازیو بازرگانیو بانقەکان، لەگەڵ ماندانی بەشی تایبەتی لە پیشەسازیو پرۆژە بەرهەم هێنەکان دا.

د/ دانانی پلانێکی درێژخایەن بۆ پیشەسازی کردنی کوردستان لە ڕێگەی دامەزراندنی پیشەسازی کشتوکاڵیو ئاژەڵیو پەرەپێدانی پیشەسازی پەترۆڵیو پیترۆ-کیمیاویو

بەهرە وەرگرتن لەو مەعدەنانەی هەن بە دامەزراندنی پیشەسازی قورس‌و ئەوانەی بۆ گەشەپێدانی وڵات پێویستن.

ھ/ دامەزراندنی ئێستگەی بەرھەم هێنانی وزەی کارەبا لە گوێی ئەستێڵە دەستکردو تاڤگە سروشتی‌یەکان دا بۆ کارەبایی کردنی سەرانسەری وڵات.

## شەشەم/ پەیوەندی نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌و جیهانی.

بۆ سەرکەوتنی بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی کوردستان لە داڕشتنی پەیوەندی‌یە نیشتمانی‌و نەتەوەیی‌و جیهانی‌یەکان دا، (ی.ن.ك) بە ڕەچاوکردنی سەربەخۆ بوون، دەست وەرنەدانە کاروباری یەکتری، گۆڕینەوەی بیروڕا، ئاڵوگۆڕی یارمەتی‌و هاریکاری جەخت ئەکات بۆ:-

أ/ پێکهێنانی یەکگرتنی ڕیزەکانی گەلی کوردستانی عێراق، یەکگرتنی کرێکاران‌و جوتیاران، بۆرجوازی بچووك‌و بۆرجوازی نیشتمانی پێشکەوتوو، یەکگرتنی تاقم‌و پیلە پێشکەوتووە جیاجیاکان لە یەکێتی‌یەکی نیشتمانی پێشکەوتووی دژ بە ئیمپریالیزم‌و کۆنەپەرستی، دژی دەربەدەرکردنی کوردو بە عەرەب کردنی کوردستان بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی شۆڕشی نیشتمانی دیموکرات.

ب/ پێکهێنانی بەرەی یەکگرتووی هەموو پارتی‌و ڕێکخراوو تاقم‌و کەسی پێشکەوتوو دیموکرات‌و مارکسیە لینینیەکانی عێراق لە پێناوی ڕوخاندنی حوکمی فاشیستی‌و هێنانە سەرکاری حکومەتێکی دیموکراتی ئیئتیلافی، کە دیموکراسی بۆ عێراق‌و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان جێبەجێ بکات.

ج/ پێکهێنانی هاوکاری پتەو لەگەڵ بەشەکانی تری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد لە سەرانسەری کوردستان دا لە پێناوی مافی چارەنووسی‌دا.

د/ پێکەوە گرێدانی خەباتی ڕزگاریخوازانەی خەڵکی کوردستان‌و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازو شۆڕشگێڕانەی (عەرەب، فارس، تورك، ئازەری، بلوچ)و گەلەکانی تر بۆ شکاندن‌و دەرکردنی ئیمپریالیزم‌و زایۆنیزم‌و ڕوخاندنی حوکمی چینە کۆنەپەرستەکانی ناوچەکە، تەواوکردنی سەربەخۆیی نیشتمانی سیاسی‌و ئابوری، وە گەشەپێدانی دیموکراسی لە ڕۆژهەلات دا.

هـ/ پێکەوەگرێدانی بزوتنەوەی خەڵکی کوردستان لەگەڵ بزوتنەوەی ڕزگاریخوازانەی گەلانی دنیای سێیەم، بزوتنەوەی شۆڕشگێڕانەی چینی کرێکاری وڵاتانی سەرمایەدارو دەوڵەتە سۆشیالیستەکان دا.

## حەوتەم/ گەشەکردنی کۆمەڵایەتی.

أ/ ئافرەت.

١- ڕزگارکردنی ئافرەت لە کۆت و زنجیرەکانی کۆنەپەرستی سەدەکانی ناوەڕاست و تەئمین کردنی مافی سیاسی، ئابوری و کۆمەڵایەتی یان و یەکسانی تەواو و هاویەشییان لەگەڵ پیاودا، وە دانانی یاسای ئەوتۆ کە مافەکانی ئافرەت لە کارکردن، خوێندن، شوکردن، جیابوونەوە و میرات دا بپارێزێ.

٢- دابین کردنی سەربەستی دیموکراتی بۆ بەهێزکردنی بزوتنەوەی ئافرەتان و خستنەگەڕیان بۆ گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری وڵات.

٣- پاراستنی مافی دایک و منداڵ، تەئمین کردنی بەخێوکردنیان و چاودێریکردنی دایکە کارکەرەکان.

٤- تەئمین کردنی کار، یان مووچەی بێکاری بۆ هەموو هاووڵاتییەکی ژن و پیاو و تەئمین کردنی مووچەی خانەنشینی و بەساڵاچوون و پەک کەوتنیان.

ب/ کرێکار

١-پاراستنی مافی کرێکارانی شارو لادێ، بڕینەوەی مووچەیەکی گونجاو لەگەڵ چۆنایەتی کارەکەیان کە لایەنی کەمی ژیانێکی ئاسوودەیان بۆ تەئمین بکات.

٢- دیاری کردنی ماوەی کارکردنی ڕۆژانە بۆ (٧) سەعات.

٣- تەئمین کردنی مافی دامەزراندنی نەقابە و جۆش دانی بزوتنەوەی کرێکاران تا دەوری مێژوویی خۆی لە ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوریدا ببینێت.

٤- تەئمین کردنی مافی مانگرتن و خۆپیشاندان.

٥- چاک کردنی شەرتەکانی کارکردن و پاراستنی کرێکاران لەنەخۆشی و مەترسییەکانی کار.

ج- تەندروستی.

١- زیادکردنی تیمارخانەو نەخۆشخانەو دابەش کردنی دکتۆرو برین پێچ بەسەر ناوچـەکان دا، بە پێی پێویستی ناوچەکانو ژمارەی دانیشتوانیان.

٢- پاراستنی تەندروستی گەل بە تەئمین کردنی تیماری خۆڕاییو لـەناوبردنی نەخۆشـییە بڵاوەکان.

٣- کردنەوەی خوێندنگاو کۆلێجی پزیشکی بۆ ئامادەکردنی کادری پێویست.

٤- بایەخ دان بە هاوینەهەوارو شوێنەکانی حەسانەوە بۆ کۆمەڵانی خەڵك.

٥- پاراستنی پاكو خاوێنی مەڵبەندی ژیان.

**<u>هەشتەم/ گەشەپێدانی خوێندنو پەروەردە.</u>**

أ/ بەزۆرکردنی خوێندن لە پلەی سەرەتاییداو ئامادەکردنی ئـەو مەرجانـەی پێویسـتن بـۆ ئەوەی هەموو منداڵێك بتوانێت لە کاتی خۆی بچێتە خوێندنگا.

ب/ بەکوردی کردنی خوێندن لە هەموو پلەکان دا لە هەرێمی کوردسـتانو پاراسـتنی مـافی نەتەوە بچووکەکانی (ئاسوری، تورکمان، کلدان) لە خوێندن دا بە زمانی خۆیان.

ج/ کردنەوەی خوێندنگای پێگەیاندنی مامۆستایان لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستان دا.

د/ فـراوان کـردنو گەشـەپێدانی زانکۆی سـلێمانی وەکـوو زانسـتگایەکی تایبـەتی هـەرێمی کوردستانو بەستنەوەی بە دەزگاکـانی ئۆتۆنۆمیـیەوەو بایـەخدانێکی تایبـەتی بـە زمـانو ئەدەبو فەرهەنگی کوردی تیایدا.

ه/ خوێندنـی زمـان، ئـەدەبو مێـژووی عـەرەب لــە هــەموو پلــەکانی خوێندنــی هــەرێمی کوردستان دا، هەروەها خوێندنی زمانو ئەدەبو مێژووی کوردلە خوێندنگاکانی ناوچەکانی تری عێراق دا لە پێناوی بـەهێزکردنی گیـانی برایـەتی لـە نێـوان هـەردوو نەتـەوەی کـوردو عەرەب.

و/ پاك کردنەوەی بابەتەکانی خوێندن لە بیروباوەڕی شـوڤێنیو کۆنەپەرسـتیو ناڕاسـتو پـەروەردەکردنی قوتـابی بـە گیـانی پێشـکەوتن خـوازیو برایـەتی گـەلانو دوژمنایـەتی ئیمپریالیزم، زایۆنیزمو کۆنەپەرستی.

ز/ دامەزراندنی ئاکادیمی زانستی کوردی لە کوردستان، لە کەسانی زاناو شارەزای نیشتمان پـەروەر بـۆ سەرپەرشـتی کردنــی نووســینەوەی مێــژووی زمــانو ئــەدەبو بزوتنــەوەی

ڕزگاریخوازانەی خەڵکی کوردستان و ساغ کردنەوەو چەسپاندنی زاراوە زانستییەکان بە کوردیی و دانانی شێوەیەکی یەکگرتوو بۆ نووسینی زمانی کوردی.
ح/ گەشەپێدانی یەکێتی نوسەرانی کوردو کۆمەڵی ڕۆشنبیرانی کوردو گواستنەوەی بارەگاکانیان بۆ پایتەختی هەرێمی ئۆتۆنۆمیی و تەئمین کردنی سەربەستی بیرکردنەوەو نووسین و هەڵبژاردنیان.
ط/ دانانی ئێستگەی ڕادیۆو تەلەفزیۆنی کوردستان لە ژێر چاودێری دەزگاکانی ئۆتۆنۆمیدا.
ی/ بایەخ دان بە سامانی نەتەوەیی و هونەریی و ئەدەبی و ژیاندنەوەو گەشەپێدانی لا پێشکەوتووەکەی فۆلکلۆرو هونەری گەل.
ک/ بایەخ دان بە هونەری مۆسیقاو گۆرانی و وەرزش، وە گەشەپێدانیان بۆ خزمەتی گەل.
ل/ دامەزراندنی دەزگای نوێی ئەوتۆی چاپەمەنی لە کوردستان دا کە بتوانێت پێویستییەکانی هەرێمەکە پڕ بکاتەوە لە ڕووی چاپ و بڵاوکردنەوە بە زمانەکانی کوردیی و ئاسوریی و تورکمانی.

کۆی ئاماری ئەو گۆڤارو ڕۆژنامانەی لە سەردەمی شاخ دا دەردەچوون، بریتی بوون لە (٣٢) ڕۆژنامەو گۆڤاری هەمەڕەنگ. لەوانەش (٢) ڕۆژنامەی سەرەکی بە ناوی (ڕێبازی نوێ) بە زمانی کوردیی و (الشرارة) بە زمانی عەرەبی، ئۆرگانی ناوەندی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوون، بێجگە لە چاپ کردن و بڵاوکردنەوەی دەیان کتێب، نامیلکە، وەرگێڕان و لێکۆڵینەوەی بابەتی هەمەجۆر.

**دووەم/ لە ڕووی پێشمەرگایەتییەوە.**

یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە ڕەچاوکردنی سیاسەتی پشت بەخۆ بەستن و بە توانا لەبن نەهاتووەکانی گەل، نەخشەی ڕزگاری کردە مانیفێستی یەکەمین بەرنامەی مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕش لەو قۆناغەدا. بۆ ئەوەی تێکۆشەرانی گەل هەنگاو ڕێی خەبات بگرنەبەرو داهاتوویان لەلا ڕوون و ئاشکرا بێت. لەو بارودۆخەدا کە پێویست بوو بە وریاییەکی زۆرەوە چالاکی پێشمەرگەیی و ڕێکخراوەیی تیا ئەنجام بدرێ و کۆمەڵانی خەڵك

بانگهێشتی نێو ڕێکخستنەکان بکرێن و توناکانی پێشمەرگە نەك هەر تەنها لە شەڕو پەلاماردانەکان دا قەتیس بکرێن، بەڵکوو پاڵپشت و هاندەرێکی سەرەکی بن بۆ داهێنانی نوێ لە ڕاپەڕینی گشتی شارەکان داو تورەیی جەماوەر لە هەلومەرجی دیاری کراودا بتەقێننەوە. بۆیە گرێدانەوەی شۆڕشی چەکداریی بە شۆڕش و ڕاپەڕینی خەڵکی شارو شارۆچکەکانەوە، یەکێك بووە لە سەرەتاترین خۆ ئامادەکردنەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئامانجەی کە (دەبێ ڕاپەڕین لە ناوەوەدا دەست پێبکات و ڕابگەیەنرێ).

نەخشەی ڕزگاری لە لایەن (مام جەلال)ەوە دارێژراو دواتر دەستەی دامەزرێنەر پەسەندیان کردو لە ڕۆژانی ٢٣و ١٩٧٦/٥/٢٤دا بڕیاریان دا یەکەم وەجبەی پێشمەرگە ڕەوانەی کوردستان بکرێتەوە.

ناوەڕۆکی نەخشەکە بەم جۆرەی لای خوارەوە بوو:-

ناوی نەخشە: ڕزگاری

ئامانج لەم نەخشەیەدا:- سەرلەنوێ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش لە کوردستان دا کە ببێت بە سەرەتایەك بۆ بەرپا بوونی شۆڕشێکی عێراقی لە کوردو عەرەب بە ئامانجی دیموکراتی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینە بۆ کوردستان.

پرانسیپە بنچینەییەکان:

١/ لەبەرئەوەی شۆڕش کارێکی جەماوەرییەو پشت بە جەماوەر دەبەستێ، بۆیە ئەرکی سەرەکیمان لەم قۆناغەدا بریتییە لە بێدارکردنەوەو ڕێکخستن و وشیارکردنەوەو سەرکردایەتی کردنی جەماوەرو ڕەچاوکردنی باوەڕی پشت بەخۆبەستن، بە گەلو بە توانا خوڵقێنەرەکانی و پەیرەوکردنی بنەماکانی شەڕی پارتیزانی سەردەم وەك سەرەتایەك کە دواتر بگوازرێتەوە بۆ جەنگێکی نەتەوەیی شۆڕشگێڕانە.

٢/ هاوخەباتی لەگەڵ هێزە شۆڕشگێڕەکانی عەرەب دا کە (نوێنەرانی جەماوەری ڕەنجدەرانن)و باوەڕیانیش هەیە بە پلەی یەکەم بە مافی گەلی کورد لە دیاری کردنی چارەنووسیدا، لە پاشان لەگەڵ هێزە نیشتمانی و پێشکەوتنخوازەکانی تر. هەروەها لە

گۆڕەپانی تێکۆشان دا، پێکەوەگرێدانی خەبات یەکە بنەماو بنچینەیەو کۆبوونەوەی نیشتمانی عێراقیش ئەو چوارچێوە نیشتمانی‌یە بەرفرلوانەیە.

٣/ هاوخەباتی لەگەڵ هێزەپێشکەوتنخوازە کوردستانی‌یەکان لە ئێران و تورکیاو ئامادەباشی بۆ هەر جۆرە گریمانەیەك بەو پێیەی کە کوردستان نیشتمانی ئێمەی دابەش کراوەو بەو پێیەی کە بێدارکردنەوەی جەماوەرەکەی و ڕێکخستنیان و وشیارکردنەوەیان ئەرکێکی هاویەشە بۆ هەموو پارتە کوردستانی‌یە پێشکەوتنخوازەکان.

بنەماکانی کارکردن:-

١/ دروست کردنی ژمارەیەك لە یەکەی چەکداری بچووك و گەڕۆك کە پێك هاتبن لە باشترین کەسانی شۆڕشگێڕ، هۆشیارو چاونەترس کە ئەرکی سەرەکی‌یان لەم قۆناغەدا بریتی‌یە لە: پروپاگەندەی سیاسی و، وشیارکردنەوە، ڕێکخستن، هاندانی جەماوەریی، بەرزکردنەوەی ورەی خەڵك، و پاراستنی ئەو کادرو کەسایەتی‌یە شۆڕشگێڕانەی کە لە شارەکانەوە رادەکەن.

٢/ ئەم یەکە چەکدارانە تا دەکرێ خۆیان دوربخەنەوە لە شەڕو پێکدادان لەگەڵ هێزە چەکدارەکانی دوژمن تا ئەو ساتە گونجاوەی بە باشی دەرەخسێ و زەنگی ڕاپەڕینی گشتی لێدەدا.

٣/ ئەو کەسایەتی‌یە وشیارو پێشەوا کۆڵنەدەرانەی کەوان لە هەندەران وردەوردە دەگەڕێنەوە بۆ ناوەوەو بۆ خۆیان حەشارگەی نهێنی و گواستراوە دروست دەکەن، و پەیوەندی دەکەن بەو ڕێکخراوانەی کە لەوێدا هەن و یارمەتی‌یان بدرێ لەسەر ڕێکخستنی جەماوەر.

٤/ لە ناوەوەدا هەڤالان چەند یەکەیەکی چەکدار پێك بهێنن بە هەمان ئەرك هەڵبسن لەسەرتانسەری وڵات دا. ڕێکخستنەکانی ناوەوەش فرمان بۆ هەڤالانی و کەسایەتی‌یە شۆڕشگێڕەکانی نزیك خۆیان دەریکەن کە چیتر گوێ ڕایەڵی بۆ فرمانەکانی میری نەکرێ و دواتر بگوازرێتەوە بۆ دەرەوەی ناوچەکە، یان داڵدە بدرێ بۆ شاخەکان بۆ هەمان مەبەست.

٥/ ناردنی چەکو تفاقی شەڕ بۆ ناوەوە بۆ دابەش کردنیان بەسەر هەڤاڵان داو ئەمبارکردنیان لە جێگای نهێنیو شاراوەدا.

٦/ پێکهێنانی سەرکردایەتییەکی مەرکەزی یەکگرتووبۆ رابەرایەتیکردنو رێکخستنی چالاکییەکانی یەکە چەکدارەکان لە سەرجەم ناوچەکان دا، لەگەڵ رەچاوکردنی پرانسیپی نامەرکەزی لە شەڕی پارتیزانیدا لە شێوەی جێبەجێکردنو تاکتیکو مەرکەزیەت لە پلانی گشتیو ستراتیجیدا.

٧/ خستنەکاری ئێستگەو دابین کردنی دەزگای بێتەلو پەیداکردنی هەندێ لە جۆرەکانی چەك وەك رۆکێتەکانی دژە تانكو فڕۆکە.

چەند پێداویستییەکی تر:

١/ دەستەبەرکردنی پاڵپشتی دەرەکی سیاسیو پڕۆپاگەندەیی- بەشێوەی مادیو مەعنەوی.

٢/ دەستەبەرکردنی ئەندازەیەك لە پارەو جبەخانە کە بەشی یەك ساڵی شەڕی پارتیزانی گەرۆك بکات.

٣/ مسۆگەرکردنی پاڵپشتی هێزە عەرەبییەکان (بەعسیو ناصری) بە لایەنی کەم، بێجگە لە هاوخەباتی راستەقینە لەگەڵ هێزە شۆڕشگێڕەکانی عێراق دا.

پێشنیاری تر:

١/ ناردنی چەند کەسایەتی سەرکردە بۆ ناوەوەو لەوانەش یەکێکیان بۆ تورکیا.

٢/ ناردنی هەندێ لە برا عەرەبەکانمان لەگەڵ وەجبەی دووەم دا.

٣/ هەوڵدان بۆ زامن کردنی هێڵی گەیاندنی خۆراکو جبەخانە.

٤/ مسۆگەرکردنی ژیان بۆ ئەوانەی رەوانەی ناوەوە دەکرێنەوە.

٥/ دانانی خشتەیەکی کاتی بۆ وەجبەکانو ناردنەوەیان بۆ نیشتمان.

٦/ دەبێ راپەڕین لە ناوەوەدا دەست پێبکاتو رابگەیەنرێ.

لە پرۆژەی رزگاریدا دەردەکەوێ، ئەوەندەی بەرنامەکە گرنگی بە راپەڕینو رۆڵی بە بێدارکردنەوەی جەماوەرو گەورەیی بە بایەخی رێکخستن داوە، نیو هێندەش لە ئایندەی

شۆڕشی چەکداری و لە جۆری دیاری کردنی بەرنامەیەکی هەڵکشاوتر نەکۆڵیوەتەوە. بەو مانایەش سەرکردایەتی یەك بزوتنەوەی چەکداریی نەکردووە بە تاکە ڕێبازو لە تێگەیشتنی هاوکێشەیەك دا وەك لە دەرهاویشتەکانی جیۆپۆلەتیکی کوردستان دا هەبووە، هەڵوێست لە ڕووداوەکان وەرنەگرێ، بە تایبەتی لە ئاست ئەو هەموو هاوسەنگی و هەماهەنگیانەی کە حکومەتو ناوەندەکانی دەورووپشت دەرهەق بە لەناوبردنی جوڵانەوەکانی کورد هەیانبووە، نەك هەر تەنها هەلومەرجی دژوار لەبەردەم بەرپاکردنی شۆڕشێکی سەرتانسەری نەتەوەیی لە پارچەوبەشەکانی کوردستان دا دەخوڵقێنێ، بەڵکوو مەودای جەنگێکی پارتیزانی درێژخایەن کەم دەکاتەوە، لە ئەنجامی ئەو هەموو پێشکەوتنانەی کە تەکنەلۆجیای عەسکەری لە بوارەکانی هێزی ئاسمانی و جەنگی پیادەوە بە خۆیانەوە بینیوویانە، لەوانەش چەکی (کیمیایی)و (ڤایرۆسی) لە گۆڕەپانەکانی شەڕدا. بۆیە ڕاپەڕین شێوە کلاسیکی یەکەی ئەو قۆناغانەی پێشوو لە جووڵانەوەکانی کورددا بەلاوە دەنێ و دەرگایەکی نوێ لە بەشداری کردنی تێکڕایی گەل بۆ گۆڕانکارییە مێژوویییەکان دەخاتە سەر پشت، کە چیتر مافەکانی نەتەوەیەك لە پەراوێزدا بە خەفەکراوی نەمێڵێتەوە.

ڕچە شکاندنی ئەو ڕۆژگارە سەختەی کە بە بازووی یەکێتی نیشتمانی کوردستان مەشخەڵی ئاگرەکەی شۆڕشی پێ تین و تاو سەندەوە، سەردەمێکی تاریك و لاسەنگ بوو کە زۆر بە گران لەسەرشانی دەستەی دلمەزرێنەر پشت ڕاست بووەوە. لە لایەکەوە وەك چۆن هۆکارە هەرێمی و ناوچەیی و نێودەوڵەتی یەکان، هەمیشە کاریگەرییان لەسەر وردوخاش کردنی بەها نەتەوەیی و سیاسی و کۆمەڵایەتی یەکانی گەلی کوردستان بەجێهێشتووە، هەر ئاوهاش لە هەمان ڕەوشی ئاڵۆزەکان دا گەلێك لە ناخەوە ڕووبەڕووی تێشکانی دەروونی و ساردبوونەوە لە درێژەپێدانی بزوتنەوەی کوردایەتی کردبووەوە. بەڵام کۆمیتەی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) بۆ بەتاڵ کردنەوەی پیلانە گەورەکەو ئینجا ڕێکخستنەوەی نیشتمان پەروەرە دابڕاوەکان لە ڕیزەکانی شۆڕش دا، سەرەتا بەشێوەی نامەنووسین و چاوپێکەوتنی ڕاستەوخۆوە هەڤاڵانیان لە دەرەوەو ناوخۆی وڵات بانگهێشتی ناو شۆڕشەکە کردو خۆیان بۆ تاقیکردنەوەیەکی گەورە ئامادەکرد.

زۆری نەخایاند بە بۆنەی ساڵرۆژی دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان-ەوە یەکەم دەستەی پارتیزان نێردرایەوە بۆ شاخ و ئیتر لە بەرواری ١٩٧٦/٦/١-ەوە شۆڕشی چەکداریی دەستی پێکردەوە. پێشڕەوایەتی کردنی ئەم پۆلە پارتیزانە بە فەرماندەیی شەهید (ئیبراهیم عەزۆ) بەڕێوەچوو کە پێك هاتبوون لە (٣٧) پێشمەرگەو بەسەر (٤) مەفرەزەدا دابەش کرابوون. هەروا بڕیار درا (نامە بۆ هەموو ڕێکخستنەکانی ناو وڵات بنێردرێ کە ئیتر ئەوانیش لەسەر بناغەی (بە چەندایەتی کەم و بەچۆنایەتی باش) دەس بکەن بە ناردنە دەرەوەی هەڤاڵانی ڕێکخستن و خەڵکانێکی نیشتمان پەروەر.

گەورەیی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش لەوەدا بوو، کە سەرکردایەتی‌یەك بێ هیچ گوێدانە زۆری و جۆراوجۆری دوژمن و ئامێرەکانی شەڕکردنیان، لە ناوەندی (٣) حکومەتی باڵادەست دا شەڕی پارتیزانی دەست پێکردەوە. ئەو ناوەندانەش ئەگەرچی بە درێژایی مێژووی تازەو کۆن، بەردەوام لە هەڵپەی فراوانخوازی و لە پچڕاندنی بەشێك لە دەسەڵات و قەڵەمڕەوی لایەکەی تر بوونە و لە ململانێی خۆچەکدارکردن و داگیرکردن و خستنەپاڵ وڵاتی یەکتریی و بەرپاکردنی دەیان هێرش و پەلاماری گەورەو خوێناوی لە دژی لایەکەی تر درێغی‌یان نەکردووە، بەڵام لەسەر ڕاگەیاندنی بزوتنەوەیەك بە ناوی شۆڕش و ڕاپەڕینی کوردو ڕزگاریی نەتەوەوە، ئەوان لەسەر لێدانی بزوتنەوەکە یەکیان گرتۆتەوەو لە مۆرکردنی ڕێکەوتنامەو لەشکرکێشی سوپاییدا بۆ بەزاندنی سنوورەکانی یەکتری هیچ لارییان لەو بارەیەوە نەبووە.

بۆیە تفەنگو شاخ یەکێك بووە لەو تاکە سەکۆیانەی دەربڕینی نارەزایی کوردان لە دژی قایل نەبوون بەداگیرکردن و جەوری نەتەوایەتی و پێشێل کردنی ئازادیيە سەرەکی‌یەکان و سڕینەوەی ناسنامەو ستەمی کورد لە نیشتمانەکەی خۆیدا. لە دژی سیاسەتەکانی بە عەرەب کردن و تواندنەوەو بەبەعسی کردن و ڕاگواستن و تەسفیرو داپڵۆسین و بێ سەرو

شوێن کردن‌و  له سێداره‌دان‌و ڕه‌ت کردنه‌وه‌ی ئازارو ئه‌شکه‌نجه‌دان‌و ده‌ست به‌سه‌ر کردن‌و مافی زه‌وت کردنی خاوه‌ندارێتی، که‌ هه‌میشه‌ نیشتمان‌و نه‌ته‌وه‌یه‌کی بۆ قوربانیدان‌و شۆڕش ئاماده‌کردووه‌.

  

ئەگەرچی بەرپا بوونی جەنگی نێوان عـێراق‌و دەوڵـەتی ئـێران، زەمینـەی لـەبارتری بۆ دەست ئلنە چەکو ڕاپەڕینی کۆمەڵانی خەڵك ساز کرد، کە چیتر حکومەتی ناوەند هێنـدەی جاران نەپەرژێتـە سـەر ڕاوەدوونـانی پێشـمەرگەو ئابڵووقـەدانی مـەفرەزە سـەرتاییەکانی یەکێتی، بە تایبەتی کە هێشتا شۆڕشەکە لە قۆناغی خۆڕێکخستنەوەو خۆناساندن‌و هەندێ جاریش خـۆ دەربـاز کـردن بـوو لـە شـێوە باوەکـەی پێشـوو لـە شـەڕی پێشـمەرگانەو خۆشاردنەوەو لێدانی دوژمن. بەڵام ڕژێمی عێراق هێشتاکە بـە وزەو توانایـەکی زۆرەوە لـە ڕووی سەربازیی‌و سیخوڕییەوە باڵادەست بوو کە ئەیتوانی لـە کورتریـن مـاوەدا سـەختترین خاڵی ئەو ناوچانە کۆنترۆڵ بکات کە گومانی لە بوون‌و مانەوەی پێشمەرگە ئەکرد.

چونکە ساڵی (١٩٧٥) بەدواوە، ئەو جادە قیرتاوکراوانـەی مـیری کـە بـە پـانی‌و درێـژی ڕایکێشابوون بۆ قووڵایی ئەو گۆڕەپانانەی شەڕ کە تا دوێنێ ڕێگر بوون لە بەرامبەر جووڵەو گواستنەوەی چەکی میکانیکی‌و هێزی پیادەی دوژمن. ڕژێم لەو ماوەیەدا بە شێنەیی بواری بۆ هەڵکەوتبوو تەنانەت ئەو جادانەی گەیاند بووە سەر بـەرزایی دژوارتریـن لوتکـەی شاخ‌و پێدەشتی دورترین ناوچەی چۆڵ لـە دانیشـتوان. بـەم کـارەش پشـتێنەیەکی سـوپایی لـە دەوروپشـتی شـارەکان دروسـت کردبـوو بـۆ چارەسـەرکردنی بـەناو هـەر (هەڕەشـەیەکی ناوەخت) کە پێش بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی، ڕووبەڕووی سوپاکەی کردبووەو ناوچەکەشی بەخۆفرۆشی نیشتمان‌و سیخوڕی موختارەکان پڕ کردبوو.

بە درێژایی ئەو جادانەش هەر یاڵەو لە تەختی بەرزاییەك دا کە دەیڕوانییە سـەر یـەکێك لـە گوندەکـان، دەبـووە شـوێنی ڕەبایـەو بنکـەی سـەربازیی هەمیشـەیی یـان گـەڕۆك‌و گواستراوە لە کاتی ڕۆژدا. بـە تایبـەتی بوونـی قوڵاییـەك ڕۆڵـی جیاکـەرەوەی دەبینـی، لـە لایەکەوە بۆ پەیوەندی کردنی ڕاستەوخۆ بە خەڵکی ناوچەکەوە لـە دەست نیشـان کردنـی هات‌و چۆو جموجۆڵی چالاکییەکانی پێشمەرگە، لەو لاشەوە تەقەکردن‌و دامەزراندنی شـەڕ لە دژی دانانی بۆسـەو داخسـتنی ڕێگاوبانـەکان کـە دوژمـن ناچـاری زوو پاشەکشـێی پـێ دەکردن، لە پاشان هەر یـەکێك لـەو ڕەبایانـەش شـەوانە ڕۆژ لـە کنـەی هـەواڵدا بـوون کـە دەیانتوانی لە ڕێگای چەندین دەزگای بێتەلەوە، نوێترین گۆڕانکـاری‌و گـەرمترین ڕووداوی

ئەو ناوچەیە بۆ دەزگا سەربازییەکانی سەرەوە ڕەوانە بکەن. بە ڕۆژیش کوێرانە تەقەیان دەکرد لە ڕێبوارانی پشت ڕێگای ئەو دیوی جادەکان‌و لە سوتاندنی دەغڵ‌و دان‌و لەوەڕگاو ڕەزو باخ سڵیان نەئەکردەوە. لە کاتی شەویش دا دەچوونە ناو کێڵگەو باخی میوەی هاوڵاتیانەوەو لە پاش دزین‌و بەتاڵان بردنی ئەوەی لە توانایاندا دەبوو، ئێنجا گڕی ئاگریان دەنا بە خەرمان‌و پووش‌و پاوانی خەڵکەکەوە. هەشبوو لە ناو گوندەکەدا ئەڵقە لەگوێ‌و پیاوی میری بوو، شەوانە بۆ نزیکترین ڕەبایەی دوژمن دزەی ئەکردو لە تازەترین دەنگوباس‌و شوێن‌و جێگای پێشمەرگە ئاگاداری ئەکردنەوە. هەروەها سەردەمێك بوو لە ناو ئەو ڕەبایانەی دوژمن، ژنانی گوند بۆیان نەبوو بە ئازادی بچنە سەرکانی‌و چەم‌و ئاو، یان لەسەر شینایی بمێننەوە، بۆ بژارکردن‌و ئاودانی کێڵگە.

کەسی باوەڕپێکراوی ڕژێم کە بە (موختار) ناوی دەبرد، لە ترسی ڕاوەدونانی پێشمەرگەو سزادانیان، سەری خۆیان هەڵگرتبوو بۆ شارەکان‌و لەوێشەوە هەڵسابوون تۆڕی نوێنەرایەتی سیخوڕییان لە ناوچەکان دا دروست کردبوو هەتا بە باشترین شێوە خزمەت بە دەسەڵاتدارانی بەعس بکەن. بەڵام شوێنی موختار دەبووە ماڵی یەکێك لە پیاوانی خۆی لە ناو ئەو شارەدا، یان سوچێکی لە چایخانەیەك هەڵدەبژارد بۆ بینین‌و چاوپێکەوتنی نوێنەرەکان لە ناوچەکانی بن دەستەڵاتی پێشمەرگەوە. ئیتر دەبوایە نوێنەری متمانەپێکراوی خۆی لەو مۆڵگایانەدا سەردانیان بکردبایەو بە زانیاری نوێ‌و لە کاتی خۆیدا موختاریان لێ ئاگادار بکردبایەتەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش ژمارەیەکی زۆر لە دەروون لاوازو خۆفرۆشی داخ لە دڵ خۆیان کردبوو بە داردەست‌و بە وردی هەواڵ لەسەر هەواڵیان لە گوندەکانەوە بۆ ئەبردن. ئەو موختارانەش بە پێی ڕێنمایی کردن لە لایەن دەزگاکانی ئاسایشی ڕژێمەوە، دەکەوتنە سۆراخی کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر ئەو پێشمەرگانەی کە لە سنوری ناوچەکەدا چەکیان لەشان کردبوو، لەوانەش بە هەواڵ پرسین لە ناوونیشانی گوندو شارو گەڕەك‌و ماڵ‌و شوێنی تایبەتی نیشتەجێبوونی هەڤاڵانی پێشمەرگە، بۆ ئەوەی کەس‌و کاری پێشمەرگە ڕاپێچی گرتووخانەکان بکەن.

هەندێ دیاردەی خێڵەکیو ڕکابەری لەناوچەکەدا دەبوون بە سەرچاوەی وروژاندنی دوو بنەماڵە لە یەکترولە پاشان بۆ تۆڵەسەندنەوە لایەنێك خۆی دەخزاندە باوەشی ڕژێمو لەلایەن (منظومة)و دەزگاکانی تری دەوڵەتەوە زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێ ئەکردن. دوای ئەوەش بۆ ئاگرخۆشکردنی ئەو ململانێیە هەرزوو فرمانی (مفرزە خاصە)یان بۆ دەرئەکردن کە دەیانتوانی سەربەخۆ بۆ هەر جێگایەك جەولەیان بکردبایە بەبێ ئەوەی هیچ ناوەندێك لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکات. چونکە حکومەتی عێراق ئەم لایەنە شەڕخوازەی نەك هەر تەنها بۆ جەنگی نێوان دوو بنەماڵەو گەرم کردنی ناکۆکی لە دژی ژمارەیەکی دیکە چەکدار دەکرد، بەڵکوو بە ئامانجی دژایەتی پێکردنی شۆڕشو کەسایەتییە نیشتمان پەروەرەکانی گوندنشین دەخستە گەڕەوە. بۆیە تەراتێنی ڕۆژانەی جاش ببووە شتێکی ئاسایی لە ناوچەکان داو لە وەختو ناوەخت دا هەڵیان دەکوتایە سەر ماڵە پێشمەرگەو دۆستو لایەنگرەکانی شۆڕش. هەروەها لە کاتی گەڕانەوەیان دا هەرجارەو قۆڵی یەکێکیان لە نیشتەجێی ئاواییەك باڵبەست ئەکردو بە بیانووی هاوکاریکردنو حەواندنەوەی پێشمەرگەوە، دەیانکرد بە یەکێك لە باشترین دیارییەکانی دەستیان بۆ داموودەزگا ئەمنییەکانی ڕژێم. ئەمەو وێڕای چاوساغی کردن بۆ لەشکرکێشییەکانی سوپاو هاوەڵی کردنی کۆپتەر لە ئاسمانەوە بۆ دیاریکردنی ئەو شوێنانەی کە جێگای مەبەست بوون لەلایەن فڕۆکەوانەکەیەوە.

یەکێك لە هۆیەکانی سیخوڕیو ئیخباریکردن لەسەر ناوچەکان، دەست تێکەڵاوکردنی ژمارەیەك لە شۆفێری نێوان گوندو شارەکان بوو بە تۆڕی دەزگاکانی ئەمنی دەسەڵاتدارەوە. کە بێ وچان لە هەوڵی ئەوەدا بوون پڕوپاگەندەی ترسو دڵەڕاوکێ لەناو خەڵکەکەدا بڵاوبکەنەوەو مەیلی سیاسیو نەتەوەیی لەلای گوندنشینەکان کەم بکەنەوە. ئەمەش لە کاتێك دا ساغ دەبووەوە کە دەکەوتنە ناو بۆسەی ڕێکخستنە نهێنییەکانی شارەوەو لە پاش دەسگیرکردنیان لەلایەن لیژنەی تایبەتی لێکۆڵینەوەوە، بە ئاشکرا پێیان لەسەر تاوانەکانی خۆیان دائەگرت، بەوەی کە دەستیان هەبووە لەسەر دیاری کردنی چەندین هاوڵاتی کوردپەروەر لە تێکۆشەرانی خاوەن هەڵوێست لە ناوچەکەو لە

چۆنیەتی ڕاپۆرت نووسینی ڕۆژانەو هەفتانە لەسەر ژمارەی پێشمەرگەو جۆری چەکەکانو شوێنی تەواوی (پ م)و سالّی پەیوەندیکردن بە ڕیزەکانو لێپێچینەوەو چاودێریکردنی هاتوچۆو سەردانی خەلّکی شارییو کەسی نامۆ لەژێر ناوی هەر میوانداریو جۆری بیانوویەك دا بوو بێت. هەروەها لەسەر ئۆبالّی بلاّوکردنەوەی واتەواتو زۆریی پڕۆپاگەندەکان، لە هێرشو پەلاماردانی سوپا بۆ سەر ئاواییەکانو نائاساییکردنی نرخو شلّەژاندنی باری دەرونی دانیشتوانەکەی، بە پاساوی ئەوەی کە گوایە لە ژێر گوشاری قەدەغەکردنی هاتوچۆو هەڕەشەی نان بڕینو چاو لیّ سوور کردنەوەدا ناچاربوون، ڕێگای وێلّی نیشتمان فرۆشی بگرنەبەر.

بە گوێرەی پیادەکردنی نەخشەیەك بۆ کێومالّ کردنی مەفرەزەکانی پێشمەرگە، هەفتانە هەلّمەتی بەربلاّوی سوپا لە چوارقۆلّەوەو هەر جارەی بۆ سەر ناوچەیەك دەستیان پێدەکرد. ئەگەرچی هێزەکانی پیادەی دوژمنیش تێکەلاّوییەك بوون لە چەندایەتی زۆری (قوات خاصە، مغاویر، جیشی شعبیو جاش)، بەلاّم ئەو هێرشانەیان بە پالّپشتی چەندین تانكو مدرعەوە ئەنجام دەداو هەروەك ژمارەیەك لە کۆپتەری بارهەلّگرو جەنگیی لە فڕۆکەخانەدا بە ئامادەباشی دەهێلّرانەوەو لەکاتی پێویست دا هەلّیان دەکوتایە سەر گۆڕەپانەکانی شەڕو لە بۆردومان کردنو سوتاندنو کاولکردنی هەر ئاوەدانییەك دا دەستیان نەئەپاراست.

لەشکرکێشییەکانی سوپا، لەگەلّ تاریكو ڕوونی دەمەوبەیانیدا دەستیان پێدەکردو لە سەرەتادا دەکەوتنە گەمارۆدانی یەکێك لە ئاواییەکانو هەر زووش جاڕی قەدەغەکردنی هاتوچۆیان دەرئەکرد. لە سەرێکەوە ژمارەیەك لە ئەمنی سوپا بە بیانووی حەشاردانی تفاقی شەڕو کەلوپەلی شاردراوی پێشمەرگەوە، دەکەوتنە پشکنینی مالّەکانو هەلّدڕینی ژێرخانی گەورەکان، لەسەرێکی ترەوە لێپرسراوی حزبی ناوچەکە گەورەپیاوانی گوندەکەی لە جێگایەك دا کۆدەکردەوەو پێی ڕادەگەیاندن:- (کە هەرجۆرە یارمەتیو دالّدەدانی پێشمەرگەیەك زۆر بە خراپ لەسەرتان دەکەویّ، ئەوساش کەسی تاوانبار ڕاپێچی زیندان دەکریّو لە پاشان بە مالّومندالّیەوە لە ناوچەکە دور دەخرێتەوە). ئینجا بۆ چاوترساندنی

خەڵکەکە،کۆمەڵێ ناوو لیستی خەیاڵی دەخستە پێش چاو کە گوایە:- (ئەم ناوانەی بەردەست هاوکارو پشتو پەنای پێشمەرگەن‌و لە لایەن کەسانی بە ئەمەکی ناو گوندەکانەوە پێمان گەیشتووە. بۆیە فرمانی گرتن‌و سزادانی ئەمانەش ئێستاکە لە جێبەجێکردن دایە). بەڵام پێش بڵاوەپێکردنی خەڵکەکە، ناوبراو پەنجەی ئامازەی بۆ چەند هاووڵاتی‌یەك درێژ ئەکردو لە پاشان بەزۆرەملێ فڕێ ئەدرانە ناو یەکێك لە ئیڤاکانەوە. ئەم دیمەنانەی گرتن‌و زنجیرەی شاڵاو بردنە سەر گوندەکان، بە درێژایی ئەو ڕۆژانەی هێرش لەسەر ناوچەکانی تر دووبارە دەبوونەوەو بۆ ئێوارەش سەرجەم هێزەکانی مۆڵ ئەدران‌و بەسەر ئاولییەکانی دەوروپشت دابەش دەبوون. چەند مەفرەزەیەکی سوپاش لەبەرزی باڵەکانەوەچوار دەوری گوندەکەیان دەگرت‌و شەو هەتا ڕۆژ دەبووەوە دەیانکرد بە دەسرێژو تەقەکردنی کوێرانە بەبێ ئەوەی لە بنەمادا هیچ گوشارێکی پێشمەرگەیان لەسەر بێ.

کۆپتەر بە ئارەزوی دڵی فرۆکەوانەکەی ڕێك لەسەر ئاولییەك دەنیشتەوە. ئەوساکەش کۆمەڵێ سەرباز هێرشیان دەکردە سەر دانیشتوانەکەی‌و چەن لاوو گەنجیان بەزۆری تێهەڵدان‌و زللە، پەلکێشی ناو کۆپتەرەکەیان ئەکردن‌و لە پاشان بۆ بارەگای لیوایەکی سەربازی‌یان ئەبردن. ئەم جۆرەی ڕەفتارکردنەش ئەگەرچی لە سەرەتادا بەناوی هەندێ زانیاری وەرگرتن‌و قسەوباس لەسەر یاخی‌بووانی دەوڵەت دەبران، بەڵام دوای چەند ڕۆژ لە زیندانی کردن‌و ئەشکەنجەدانی جەستەیی‌و دەروونی ئازاد ئەکران. هەروەها ڕۆژانەش کۆپتەر، هەڵمەتی لەناکاوی دەبردە سەر ڕێگاوبانەکانی هاتوچۆکردن‌و لەبەرزایی نزمەوە خەڵکێکی کاروانچی‌و سواربووی وڵاخی ناچار بە هەڵڕشتن‌و ژێرویان کردنی کاڵاو شمەکانیان ئەکردو ئەو ئۆتۆمبیلانەش کە دوور لە جادە قیرتاوکراوەکان ئەڕۆیشتن، سەرنشینەکانی ملکەچی دابەزین ئەکرد بۆ ئەوەی بزانێ چەکداری یان نەء.

هێزی ڕاکردوو لەناو ڕژێمەوە بۆ شاخ، پێك هاتبوون لە چەندین چەکداری جەیشی ئاشەعبی‌و هەروەها لە سەربازی کوردی هەڵهاتوو لە ڕیزەکانی سوپاوە بۆ ناوچەکانی بن دەسەڵاتی پێشمەرگە. بە تایبەتی زۆربەی ئەو ڕاکردووانەش بە چەکو تاخمەوە یان ئەوەتا

پەیوەندییان ئەکرد بە هەرێمەکانەوەو لە مەفرەزەو کەرتەکانیدا ئەبوون بە پێشمەرگە، یان چەکو پێداویستییەکانیتریان لە بەرامبەر بڕێك پارە بە دانیشتوانی گوندەکان ئەفرۆشتو لە سنوری ئاواییەك دا دادەنیشتن. ئەمەش لە لایەکەوە دەرگای هەڵهاتنی بۆ سەربازەکانی ترو ئەو چەکدارانەی دیکەی ڕژێمیش ئاوەڵا دەکردەوە کە چیتر لە خزمەت کردنی بەعس پاشەکشێ بکەنو بە خۆیانو چەکەکانیانەوە سەنگەری شاخو ڕێگەی سەرفرازیی گەلەکەیان بگرنەبەر، لە لایەکی دیکەوە چەکی بێ شومارو پێداویستییەکانی تری شەڕیان بۆ هێزەکانی پێشمەرگە دابین ئەکرد. ئیتر دیاردەی چەك ڕفاندنو زۆربوونی ژمارەو جۆری تەقەمەنی لەلای خەڵکەکە، زەمینەی بازاڕێکی چەکی بۆ بازرگانی کردن ڕەخساند بوو کە ڕێك تەواوکەری ئەو پێداویستییانەی شەڕی پارتیزانی بێتو داواکارییەکانی پێشمەرگەی پێ پڕ بکاتەوە.

لەم ساڵەش بەدواوە گەلی کوردستان دووچاری سەخترین ژیانی پڕ لە کارەساتو مەینەتی ڕاوەدونان بووەو سوپاکەی بەعسیش بەوپەڕی دڕندایەتیەوە کەوتە پیادەکردنی جەورو تواندنی زەبروزەنگی سەربازی. لەلایەکەوە هێرشی ئاسمانی بە کۆپتەرە جەنگییەکانی بۆ سەر ناوچەکان چڕو پڕو زیاتر کردو لە بۆردومان کردنی ناو گوندەکانو خەڵکی بێ تاوان دەستیان نەئەپاراست. لەلایەکی ترەوە یەکەکانی سەرپشك کرابوو لە گوللەبارانکردنی شوانو جوتیاری ناو کێڵگەو لە سوتاندنی ڕەزو باخو لە کاولکردنی گوندو بەتاڵان بردنی ڕانەمەڕو پێداویستییەکانی ناوماڵی ڕەشو ڕووتی ناوچەکان سڵ نەکەنەوە. هەروەها میری بەهۆی جەنگەکەیەوە لە بارێك دا بوو کە وردە وردە دەسەڵاتە عەسکەریو تواناکانی لەسەر ناوچەکان لە دەست بداو ئەوەندەی ساڵانی پێشوو نەپەرژێتە سەر کاروباری خەڵکەکەو زیاتر بوونی چالاکییەکانی پێشمەرگە. بۆیە ناچاربوو فرمانی پاشەکشێ بۆ ئەو هەموو ڕەبایەو یەکە سەربازییانەی دەربکات کە پێشتر لە قوڵایی دوورترین خاڵی ئەو ناوچانە سەقامگیری کردبوون. بەمەش ناوچەی ئازادکراو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە زیاتردا ئەبوون. بەڵام ڕژێم سیاسەتێکی نوێی گرتەبەر کە بریتی بوو لە (پیلان گێڕان بۆ شەهید کردنی فەرماندەکانی پێشمەرگە).[٢]

---

[٢]) ئەم نووسراوە بە (سري للغاية)و لەژێر ناونیشانی(ازدياد نشاطات المخربين في شمال العراق)، واتە زیاتر–

ستەمو چەوسانەوە کە هەمیشە وروژاندنی ئەو دەریا پڕ لە هەڵچوونەی کوردان بووە لە دژی داگیرکردنو بە کەم تەماشاکردنی کەسایەتی نەتەوەیی، بێچارە دەستی داوەتەچەکو بەڕاپەڕینو شۆڕشی درێژخایەنو قوربانی زۆرەوە پیلانە هەمیشەیی‌و کاتی‌یەکانی پووچەڵ کردۆتەوە، لە هەلومەرجی گونجاو دا خۆی باشتر ڕێکخستۆتەوەو دەنگی ناڕەزایی هەڵبڕیوەو داواکاری‌یەکانی بەرزکردۆتەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش لە کۆتایی ئەم ساڵەدا گەلێك بە لێشاو ڕووی کردە شاخ‌و سەنگەری مانو‌نەمانی هەڵبژارد. لە سەرێکەوە ڕیزەکانی پێشمەرگە لە چاو سالانی پێشوو بە ژمارە زۆرترو لە چالاکی‌دا گەرمو گوڕتر دەبوونو لە سەرێکی ترەوە ئاراستەی شۆڕشەکەش بەرەو قۆناغی نوێ‌و گۆڕانکاری وەرچەرخێنەر هەنگاویان هەڵدەگرت.



---

– بوونی چالاکی‌یەکانی پێشمەرگە لە کوردستان دا، ساڵی (١٩٨١) لە یەکێك لە نەبەردەکانی پێشمەرگەدا کەوتە بەردەست. ناوەڕۆکەکەی بریتی‌بوو لە چەند ڕێنماییەکی ورد کە لە لایەن (ئیستخباراتی عەسکەری)یەوە نێردرابوو بۆ تێکڕای یەکە سەربازی‌یەکانی سوپا لە (فیلق)ی (١)، بۆ ئەوەی ئەمانیش لە ڕێی خۆیانەوە خەڵکی بەکرێ گیراو لەناوچەکەدا هان بدەن بۆ بەگژاچوونەوەی شۆڕشەکە کە بەردەوام لە تینو تاوسەندن دا بوو. یەکێك لەو بڕگانەش لە دوو توێی ئەم نوسراوەدا هاتبوو، بریتی بوو لە (دفع عناصر كردية لإغتيال قادة المخربين).

سەكۆی چالاكی‌یەكانی پێشمەرگە بە پێی باری هەڵكەوتنی ناوچەكەو لەسەر بنەمای سروشتی‌و دەستكردی جوگرافیاكەی ڕێك خرا بوو. بەمەش هەڵكەوتەی یەكێك لە ناوچەكان كە ڕوبەرەكەی پانتایی چەندین ئاوایی لەخۆگرتبوو لەو قۆناغەدا كەوتبووە ژێر دەستەڵاتی بچوكترین پێكهاتەی مەفرەزەوە لە مەفرەزە سەرەتایی‌یەكانی شۆڕش. هەروەها بۆ جیاكردنەوەی سنوری هەریەكێكیان مەفرەزەیەك ناوەكەی هەڵگری هەمان شوناسی شوێنەكەی ئەبوو كە پێشتر ناوچەكەی پێ ناویراوە. لەگەڵ ئەوانەش دا هەر ئەو ناوچەیە دەبڕوانی‌یە سەر چەند ڕێگایەكی قیرتاوكراوی سەرەكی كە شاری گەورەو شارۆچكەكانی بە هێڵی ناوچەكانەوە دەبەستەوەو لە بەرامبەردا ئەبوون بە لەمپەری دابەش كردنی دەستكردو جیاكەرەوە لە یەكتری، یان بەهۆی ڕێڕەوی ئاوو سروشتی پێكهاتەی زنجیرەیەكی شاخ كە دوو دەسەڵاتی مەفرەزەی هاوسنوری لە یەكتر جیا دەكردەوە.

ئەم سنورانەش ئەگەرچی لە ڕووی دابەش بوونەوە بە مەبەستی فراوانتركردن‌و دەركەوتنی جێگادەستی هەر یەكێك لەم مەفرەزانە لە قۆڵی جیاجیاوە بۆ گورزوەشاندن پۆلێن كرابوون، بەڵام لەهەلومەرجی پەلاماردان‌و لە هەر هێرشێكی بەربڵاوی دوژمن بۆ سەر ناوچەیەك ئەم لەمپەرانەی سنور كاڵ ئەبوونەوەو لەلایەن مەفرەزەی ناوچەكانی ترەوە هێڵەكانیان ئەبەزاند. ئەوساكەیش شەڕی تێكشكاندنی نەخشەو گەمارۆدانی سەر پێشمەرگەیان لە پشتەوە بەتاڵ ئەكردەوەو هێزەكانی میری‌یان ملكەچی پاشەكشێ ئەكرد. بۆ لەمەودواش ئەبووە داب‌و نەریتێكی شۆڕشگێڕانەو لەسەرجەم قۆڵەكانی ترەوە پیادەیان ئەكرد، بەو پێیەش لەكاتی شەڕدا ببن بە پاڵپشت‌و بچن بە هانای یەكتری‌یەوە.

ئەو كات هەرەمی ئۆرگانەكانی هێزی پێشمەرگەی كوردستان بریتی بوون لە پێكهاتەی (مەفرەزە، كەرت، هەرێم، مەكتەبی عەسكەری)، كە ئەمەی دواییان بەرزترین دەسەڵات بوو لە ڕووی كاروباری پێشمەرگەییەوە. ئەرك‌و دەسەڵاتەكانی بریتی‌بوون لە ڕێنمایی‌كردن‌و بەگەڕخستن‌و سەرپەرشتیاریی‌و مشورخواردنی كێشەو پێداویستی ئۆرگانەكانی خوارەوە، هەرچی لە دابین كردنی تفاقی شەڕو سازدان‌و جۆری ڕاهێنان‌و مەشق پێكردنی فەرماندەو پێشمەرگە بە پێی بەرنامەی نوێ‌و قۆناغی نوێ لە ئاراستەكردنی شەڕی پێشمەرگایەتی‌و

لەسەر بەکارهێنانی چەکو شاخو سەردەم بۆ بەرپەرچ دانەوەی نەخشەو پیلانەکانی ڕژێمو لایەنگرانی شۆڕشی چەواشە. هەروا لەسەر ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەو سزادانی کەسی ناشایستە لە ڕێك لێپرسراویتی پۆستەکەیدا، بە سەرنج ڕاکێشانو لەکارخستنو دواتریش دەرکردنی لەناو ڕێکخستنو ریزەکانی پێشمەرگە. لە پاڵ بوونی دەسەلاتی نووسینو بلاوکردنەوەو دەرکردنی بەیاننامە لەسەر چالاکیەکانی پێشمەرگە. ئەم ئۆرگانەش پێك هاتبوو لە چەند هەڤاڵێکی بە ئەزموون لە ئەندامانی کۆمیتەی سەرکردایەتی (ی.ن.ك).

هەرێم ڕاستەوخۆ بەرپرسیار بوو لە بەرامبەر لێپێچینەوەی دەسەلاتی مەکتەبی عەسکەری. سنورە کارگێڕییەکەی لەچەند ناوچەیەکی کەرت پێکهاتبوو کە ڕۆژهەلاتی بە ڕۆژئاواو باکوری بە باشور ئەبەستەوە. بەلام بۆ دابەش کردنی دوو دەسەلاتی هەرێم یان ئەوەتا سروشتی شاخاوی زنجیرەیەك شاخ ئەیانیکرد بە دوو بەشەوە، یان بە درێژایی ئەو هێڵەی کە جادەیەکی قیرتاوکراوی گشتی لە نێوان دوو شاردا ئەمیانی لەویانی تر جیا ئەکردەوە. فەرماندەی هەرێم بەرپرس بوو لە دانانو لابردنی فەرماندەی کەرت یان فەرماندەی مەفرەزە لە پاش پرسو ڕاکردن بە (مەکتەبی عەسکەری).

کەرت ناوەندی چەند ژمارە مەفرەزەیەکی هاوسنوری پێك ئەهێنا کە ئەرکی ڕابەرایەتی کردنی ئەو مەفرەزانەی لەسەر شان بوو کە دەکەوتنە ناو سنوری یەکە جوگرافیاکەیەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش فەرماندەی کەرت بەرپرسیار بوو لە جۆشدانو بەگەڕخستنو چالاك کردنی مەفرەزەکانی کەرتەکەی لە دەست وەشاندنو هەراسان کردنو پشوو پێ نەدانی دوژمن لەناو سەربازگەو لەسەر ڕێگاوبانەکانی هاتوچۆکردنو لە هەلکووتانە سەر بنکەو بارەگاکانی جاش. هەروەها بەرپرس بوو لە دانانو لابردنو شوێنو جێگا پێ گۆڕکێی فەرماندەی مەفرەزە لە دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی (هەرێم).

مەفرەزە ئۆرگانی بچووکترین پێکهاتەی یەکەیەکی پێشمەرگایەتی بوو. ئەو قۆناغەش بەهۆی ژمارە کەمی چەندایەتی پێشمەرگەوە، مەفرەزەیەك لە نێوان (٨) تا (١٢) کەس لە پێشمەرگەی پارتیزان پێکهاتبوو، بە چەکێك کەنەك تەنها بە شێوە باوەکەی شۆڕشی پێشوو چەکدار ببوون، بەلکو بە خراپترین تفەنگی ژەنگاویو ئەو چەکانەی کە هی

بەكارهێنانی ناو شەڕ نەبوون ئەوەندە ناولخنی لوولەو بەشەكانی تریان پڕاوپڕ بوون لە خۆرە یان سواو بوون بەهۆی وادەی بەسەرچوونی تەمەنیان لە زۆریی بەكارهێنان دا. ئەمەو سەرەڕای پێكەوە نەگونجانی چەندین پارچەی تفەنگ كە بە كۆكردنەوەی لاشەو بەشەكانی تریان لێرەو لەوێ خرابوونە سەر یەك، كەبەباشی لەگەڵ بەرامبەرەكەیدا ڕێك نەئەكەوتن یان لەشەڕدا ئەو نیشانانەی بە دروستی نەئەپێكا كە جێگای مەبەست بوون.

تفەنگی بەرەنگاربوونەوەی پێشمەرگە، لە ململانێی چەكی سوپایەكی مۆدێرن دا كە شەڕی بە سادەترین تفەنگی سەرەتاییەوە ئەكرد، لەو قۆناغەدا بریتیبوون لە (بڕنەو، كلاشینكۆف، پەرەشووت، ئار بی كەیو ژ/٢، هەندێ جاریش بە چەكی (ئارپیجی)و(ڕەشاش ژ/٣))، كە ئەم دوو چەكەی دوایی لە سنووری مەفرەزەكانی كەرتەكەدا دەستاو دەستیان پێ ئەكرد.بۆ ئەم مەبەستەیش فەرماندەیەكی مەفرەزە ئەگەرییویستبایە لە سنووری ناوچەكەی خۆیدا چالاكییەكی گەورەی ئەنجام بدابایە، دەبوایە پێشتر داوای وەرگرتنی یارمەتی بۆ یەكێك لە چەكەكان لە مەفرەزەكەی هاوسنووری بكردبایە.

كۆمیتەی سەركردایەتی، بەردەوام لە هەوڵێكی تایبەتیدا بووە بۆ دەستەبەركردنی ژمارەیەك لە كەرەستەو تفاقی شەڕكردن هەتا لەڕێی پیتاكو كۆمەكی لایەنگرەكانی خۆیەوە ڕەوانەی كوردستان بكرێتەوە. بۆ ئەوەش لایەنی كەم شۆڕشە ساواكەی گەلی كوردستان لەسەر هەردوو قاچی بووەستێنێو پێداویستییەكانی ئەو قۆناغەش لە شەڕی پارتیزانی پێ مسۆگەر بكەن، لە كاتێك دا مەفرەزە سەرەتاییەكانی شۆڕش لەوپەڕی لاوازیو بێ توانایی‌دا خۆیان دەبینییەوە. بەلام بەهۆی دەوڵەتانی دەوروپشتەوە كە دەروازەی پەڕینەوەو گواستنەوەی پێداویستییەكان بووە، دەستیان بەسەرا گیراوەو بەو پێیەش نەیان هێشتووە تواناكانی پێشمەرگە پەل بهاوێو شۆڕشەكەیش چوارچێوە سەرەتاییەكان تێپەڕێنێ.

لەسەرویەندی فراوان بوونی هێزو ژمارەو پەرەسەندنی چالاكییە عەسكەریو سیاسییەكانی پێشمەرگە لە كوردستان دا، ڕژێمی فەرمانڕەوا هەرزوو بە بەرنامەو خۆسازدانو نەخشەی جۆراوجۆرەوە ڕوبەڕویان بووەوەو لە بەرامبەردا چەندین

قەلاوپێگەی سەربازی لەدەرەوەی شارو شوێن و ناوچە جیاجیاکانی تری کوردستان دروست کردو لە ڕێگای کۆبوونەوەو ناردنی نوسراوی نهێنی و تایبەتەوە ڕێنوێنی دام و دەزگا حزبی و ئەمنی یەکانی ئەکرد لەسەر هاوکاری کردنیان بۆ دروست کردنی (مەفرەزە خاصە) لە هەموو شارو شارۆچکەیەك داو لە سوپاش دا تەسریح کردنی سەربازی یەدەگی و خانەنشین کردنی خۆبەخشەکانیان هەڵپەساردو لەسەرەتای هەشتاکانیش دا چەند پێکهاتەیەکی تریان لە (تەواری)و لە هێزەکانی (گاردی کۆماریی) دروست کرد.

حکومەتی عێراق ئەو کاتەی شەڕی بە شێتان فرۆشت، لایەنی کەم خاوەنی تازەترین تەکنیکی بواری شەڕی سەربازی بوو، لە پاڵ هەڵپەی خۆچەکدارکردنی ساڵانەی بۆ بەدەست هێنانی چەکی ستراتیژی ئەو سەردەمە لە دابین کردنی (وزەی ناوکی)و (چەکی کیمیایی) بۆ لەناوبردنی بە کۆمەڵ. بەجۆرێ داخ لە دڵی صدام بەهۆی ئەو نووشستی یە سەربازی یەی لە ئەنجامی بێ تفاقی یەوە لە شەڕی پێشمەرگانەی ئەیلول دا لە هێزەکانی کەوتبوو، توانیبووی تەنها لە ماوەی (١٤) مانگ لە وەرگرتنی لێپرسراوێتی پۆستەکەی دا، گەورەترین ئەمباری تەقەمەنی و فراوانترین پێداویستی چەکەکانی شەڕی (قادسیە)، لە دوو سەرچاوەی بازاڕی چەك فرۆشی (ڕوسیا)و (چین) پەیدا بکات. هەروەها بۆ بەرهەم هێنانی نوێترین جبەخانەی چەك، بە سەدان پسپۆڕو کادری عەسکەری لە ڕوسیاوە کرد بوون بە سەرپەرشتیارو هەڵسوڕینەری دام و دەزگاکانی (تصنیع العسكري) لە عێراق دا.

بۆ دەست بەسەرا گرتنی کوردستانیش، ڕژێمی دەسەڵاتدار دوو سوپای مەشق پێکراوی لە فەیلەقی (١)و لە پاشان (٢)و (٥)ی بۆ پاڵپشتی یەکەم لە کوردستان جێگیر کرد بوو، کە بە تازەترین چەك و جۆری ڕاهێنان و دیسپلینی سەربازی و زۆرترین ئامادەبوونیان لە شەڕدا ناویانگیان دەرکردبوو. بۆ ئەم مەبەستەیش پێکهاتبوون لە سەدان یەکەی جۆراوجۆری پیادەو لە هێزی ئامادەباشی کتوپڕو لە کەتیبەی تانکەکانی شەرکەرو لە چەندین تۆپخانەی دوورهاوێژو لە دەیان ڕشتەکانی هەندەسەی سەربازی و لە یەکە تایبەتی یەکانی پەرەشووت و لە هێزەکانی بنکەی ئاسمانی بۆ بەکارهێنانی فڕۆکەی بۆمباهاوێژو کۆپتەری بارهەڵگرو جەنگی لە دەوروپشتی شارەکان و نزیك لە سەنگەرەکانی

پێشمەرگەوە. لە پاشان وەزارەتی بەرگری عێراق لە زۆربەی سەرچاوەکانی بەرهەم هێنانی چەکەوە باشترین کەرەستەو پێداویستییەکانی جەنگی پارتیزانی بۆ ئەم یەکە تایبەتییانەی دەستەبەر ئەکرد.

شەڕی پارتیزانی، یەکێک بووە لە تاکەڕێی خەبات کە یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەو ڕێبازە بە ناچاری بگرێتەبەرو لە ڕێگای شۆڕشی چەکدارییەوە هەموو ئەو تاوانو ستەمو پێشێلکارییو کورد کوژییانە بەرپەرچ بداتەوە. تێکۆشەران لە دەوری ئامانجەکان دا کۆبکاتەوەو زەمینەش بۆ ڕاپەڕینو شۆڕشی سەرتاسەری بڕەخسێنێ. چونکە دەسەڵاتدارانی بەعس کە زادەی جۆرو هەڵقوڵاوی ناو سیستەمەکانی سەدەی ڕابردووی پڕ لە زەبروزەنگو داپڵۆسین بووە، هیچ کاتێک دەرووەیەکی ئازادییان لەبەردەم مافی بەشخوراوانی گەلی کوردستان نەهێشتۆتەوە بێجگە لە تێگەیاندنی بە زمانی تفەنگ نەبێ.

ئیتر لەو قۆناغەوە شۆڕشێک بووە چرای ئومێدو ئاواتی سەوز لەناو بزووتنەوەی نەتەوایەتی کوردا کە هەم بتوانێ پەکی سیاسەتەکانی ڕژێم بخات لە ڕووی جێبەجێکردنەوە، هەمیش لە کورترین ماوەدا بووە جێگرەوەی متمانەو سۆزو لایەنگری سەرجەم نیشتمان پەروەرانو چینو توێژەکانی خەڵکی کوردستان بەلای خۆیدا ڕابکێشێو لە زۆر بارودۆخی هەوراز و نشێودا لێ نەبڕاوانە درێژە بە شۆڕشە ڕزگاریخوازەکەی گەلی کورد بدات.

پیرۆزی ناوی پێشمەرگە، بۆ جارێکی تر لەناو کولتووری نەتەوایەتیدا بووە هێماو نموونەی قوربانیدانی کوردو بەرزڕاگرتنی هەڵوێست. ئەو دڵخوازەی گەل کە گیان بەخشینی نەخشاند بوو بە ڕەنگی ڕێبازەکەی کەم ژیانو کەڵ ژیان، بە هەڵگرتنی هەمان بەڵێنو پەیامی ئەو ئامانجانەی کە لەسەر ڕژاندنی خوێنی شەهیدان بووە. لە خەبات دا ئەسرەوتنی هەتا سەرکەوتن هەڵبژاردو کردی بە بنەماو دروشمی ئازادیخوازانو پەیڕەوەکەی کوردایەتی سەردەم. لە ویژدانی گەلەکەیدا بووە فریاد ڕەسو مرۆڤێکی ئەفسانەییو لە شکست نەهاتوو کە هەردەم بازنەکانی مەرگو تیاچوون بیەزێنێو لە گۆڕەپانەکانی شەڕدا تەنانەت ببێتە جێگای سەرسوڕمانی دۆستو هاوپەیمانەکانی خۆیو لە تۆمارکردنی ئەو نەبەردییانەدا هەتا ئەوپەڕی تێڕامان عەقڵی دوژمنانیشی پێ سەرسام

کرد بێت. مەرج دانان، گرنگی‌یەکی تایبەتی هەبوو لە وەرگرتنی هەڤاڵانی نوێ بۆ ناو ڕیزەکانی پێشمەرگە، بەتایبەتی بۆ پاراستنی یەکڕیزی‌و یەکێتی ئاراستەی بیرو تەبایی دڵو دەروون لە ناو ئەو چوارچێوەیەدا، لەپاڵ سنوورکردنی دیاردەکانی گێرەشێوێنی‌و ڕێگاگرتن لە دزەی پیاوانی سیخوڕو لە ئەگەری شێواندنی بنچینەو بەهاکانی شۆڕش‌و پێشمەرگایەتی. بۆ ئەم مەبەستەیش ئەو مەرجانەی کە دەبوایە ئۆرگانەکانی خوارەوە پابەند بن بە سەرتاکانیەوە، بریتی‌بوون لەسەر بناغەی وەرگرتنی کەسی (متمانە پێکراوی ڕێکخستن)، پشتگیری (تاکە کەس لە ناوچەکەو دەرەوە)، هەڵوێستی (نیشتمان پەروەرێتی‌و ڕابردووی ڕوون). مەرجی هاتنە ناو ڕیزی سەنگەرەکانی پێشمەرگە بوون.

مەرجی یەکەمیان لەسەر بنەمای پێشینەی خەبات‌و بە پێی هەڵسەنگاندنی پێشوەخت ئەکرا بە پێشمەرگە، کە ئەبوایە هەر هەڤاڵێکی نوێ لە سەرەتای چوونی بۆ شاخ بە پێی نووسراوی ڕێکخستن پاڵپشت بکرێ‌و لایەنی کەمیش پلەی ڕێکخراوەیی بەدەست هێنابایەو لەناو یەکێك لە ئۆرگانەکان دا ئیش‌و کاری ڕێکخستنی ببردبایە بەڕێوە. ئەم هەڤاڵەش بێجگە لەوەی کە نموونەی باشترین لاوچاکی گەلەکەی بوو، هەروەها نموونەی چالاکترین کەسایەتی تێکۆشەرو باوەڕپێکراوی شۆڕشەکەش ئەبوو. چونکە یان ئەوەتا لە ئەنجامی ئیشکردن دا ئاشکرا ئەبوو، ئیتر ئەبوایە بهاتبایەتە دەرەوە، یان ئەوەتا لەناو زەبروزەنگو سەردانەنواندنی بۆ بکوژانی کورد ڕێگای شۆڕش‌و خەباتی ئەگرتەبەر.

مەرجی دووەمیان ئەبوایە بەپێی متمانەی یەکێك لە دانیشتوانی گوند یان لە دەرەوەی ناوچەکە پاڵپشت بکرێ. لەلایەکەوە بۆ ئەوەی کەسەکە وەك بارمتەیەك لە جێگای ئەو زیندانی بکرێ لە ئەگەری ڕفاندنی ئەو چەکەی لە شانی ئەکرد، لە بەرامبەر قەرەبۆکردنەوەو زیان گەیاندنی تری بە شۆڕشەکە، یان لە ئەگەری دۆڕاندنی هەڵوێست لە کاتێك دا کە ویژدانی بفرۆشتایە بە ڕژێم‌و کاری سیخوڕی ئەنجام بدابایە لە دژی هێزەکانی پێشمەرگە.

مەرجی سێیەمیان دەرگای لەسەر پشت کراوە بوو لە وەرگرتنی تێکڕای ئەو نیشتمان پەروەرانەی کە لە بنەمادا نیشتەجێی ناوچەکە بوون. ئەوەندەش تەنها بەس بوو کە

بزانرێ خەڵکێکی ناسراون و بە مەبەستی کوردایەتی و گیان بەخشین بۆ بەدیهێنانی سەروەرییە باڵاکانی گەل هاتبن بۆ پێشمەرگایەتی، نەک بە نیازی شەڕو ناکۆکی و دەست وەشاندن لە بنەماڵەیەک چەک لە شان بکەن و لە ژێر دەمامکو شکۆی ناوی پێشمەرگەوە وێنە جوانەکانی شۆڕشەکەو بەهاکانی بشێوێنن.

لەگەڵ هاتنە دەرەوەی هەر مەفالێکی نوێ بۆ ناو مەفرەزەکانی پێشمەرگە، دەبوایە پێشوەخت ناوێکی نهێنی تایبەت بەخۆی هەڵبژاردبایە لە بری ئەو ناوەی کە پێشووتر پێی ناسراو بووە. چونکە دەزگاکانی سیخوڕی عێراق لە بۆسەی تێکۆشەرانی کورد بوون لە کاتێك دا پەیوەندییان بکردبایە بە شۆڕشەکەی شاخەوە، هەرزوو ئەکەوتنە سۆراخی شوێن و جێگای نیشتەجێبوونی پێشمەرگەکە هەتا کەس و کارەکەی ڕاپێچی گرتووخانەکان بکەن و بیانکەن بە کارتێکی جەخت لەسەر گەڕانەوەو خۆبەدەستەوەدانی بە پەلەی باوکەکە یان کوڕەکەیان.

گرنگی شارەزا بوون لە جوگرافیای سروشتی ناوچەیەك کە بۆ خۆی ناوەندی شەڕو خاڵی خۆڕێکخستنەوەو پەلاماردان بووە، بۆ مەفرەزەیەکی پارتیزان و گەڕۆك بایەخێکی گەورەو تایبەتی یان هەبووە لە کاتێك دا کە هەر لەوێوە پلان و نەخشەکانی شەڕ دا بڕێژرێ و ببنە مەیدانەکانی جەنگو وێستگەی پاشەکشێ و یەکگرتنەوە بن لە دوای ئەنجام دانی هەر چالاکییەکی پێشمەرگانەو بەو پێیەش بەرنامەی شەڕ بە گوێرەی ئارەزوومەندانەی پێشمەرگە دیاری بکرێ، نەك سەپاندنی بەزۆرەملێ لە لایەن لەشکرکێشی سوپایەك کە سەرجەم تواناکانی خۆی لە چەکی ئاسمانی و زەمینی لە ئامادەباشیدا بن و شەڕەکەش لە کۆتاییدا ب قازانجی پێشمەرگە تەولو نەبێ. بۆیە شارەزا بوون لە دژوارترین هەلومەرجی نائاسایی کەش و هەوادا، ئەوەندەش زیاتر زەمینەی چالاکییەکی سەرکەوتوانە ئەڕەخسێنێ و دەستەیەکی پارتیزان هیچ باکی نەبێت کە چۆن لەو کاتانەدا گورزی کاریگەر لە دوژمنەکانی ئەوەشێنێ و چۆن دواتر دۆش دانەمێنێ لە دۆزینەوەی ئاراستەو هێڵی پاشەکشێی مەفرەزەکەی بە باشترین شێوە.

مەفرەزەیەك لە سەرەتادا هیچ ئەوایەكی بۆ پشوودانو شوێنی حەسانەوە نەبووە.
بەڵكوو بێ پەروا لە سەختی ڕێگادا ئاسمانی بە سەرپۆشو بەتانی، زەوی بە ڕاخەرو سەرین هەڵبژاردبووەو كردبوویەتی بە شایستەترین پێوەری خەبات. بە جۆرێ ئەستەم بوو لە كاتی ڕۆژدا حەشارگەو شوێنی خۆشاردنەوە بەجێ بهێڵێو بە ئاسانی ڕوو بكاتە ناو گوندو چاوی بە خەڵكو ئاوەدانی بكەوێ. یان هیچ نەبێ لە وادەی ژەمێكی بەیانیو نیوەڕۆدا بە ئارەزووی دڵ دابەش ببنو نانێكی گەرمی ماڵە جوتیار بخۆن. چونكە لە ماوەیەكی زۆر كەم دا گەلەجاشو جەیش هەڵیان ئەكوتایە سەریانو یەكسەر چواردەوری گوندەكەیان ئەگرت. كۆپتەریش لە بەرزایی نزمەوە دۆڵاودۆڵو شاخ بە شاخو شیواوشیوی ناوچەكەی ئەپشكنیو بە پاڵپشتی چەكدارەكانی حزب بەشدارییان لە پرۆسەی ڕاوەدونانەكەدا ئەكرد. تەنانەت بۆ پێشمەرگەیەكی بریندار بنكەو بارەگایەك نەبووە تا لە نزیكەوە چارەسەری پێویستو بەدواداچوونی ڕۆژانەی بۆ بكرێو تاسەو كاتەش برینەكەی سارێژ دەبێتەوە لایەنی كەم تیایدا بمێنێتەوە.
پێشمەرگەی پارتیزان پێش ئاوابوونی خۆرو دڵنیا بوون لەوەی كە ئیتر چەكدارەكانی دوژمن زاتی ئەوەیان نییە بۆ ناوچەكە دەربچنو بەو شێوەیە پەلامار بدرێن، لە شوێنو پەناگاكانی ڕۆژەوە خۆیان دەرئەخستو لە ماوەی ڕۆیشتن دا هەردوو پێشمەرگەو بە هاوشانی یەكترییەوە نێوانیان بەجێ ئەهێشتو هەتا ئەگەیشتنە نزیك ئاواییەك لەوێ یەكیان ئەگرتەوە. بەڵام پێش دابەش بوونی مەفرەزەكە، نهێنی شەویان بە گوێی یەكتریدا ئەچرپاندو لە ئەگەری دابڕان دا گوندێكی تریان دەست نیشان ئەكرد. دوای ئەوەش نانو پێخۆری بەیانیو ژەمێكی نیوەڕۆیان هەڵدەگرتو لە جێگایەك دا كۆئەبوونەوە، ئینجا بۆ شوێنی دیاریكراوی خۆیان بەڕێ ئەكەوتن.
لەبەر دیاردەی بێ چەكی، ئەبوایە هەر هەڤاڵێكی تازە بوو بە پێشمەرگە تا ماوەیەكی زۆرو دیاری نەكراو بەبێ چەك شان بەشانی مەفرەزەكەی لە چالاكیو جەولە كردن بوایە تا ئەو كاتەی چەكێك پەیدا ئەكرا. بۆ ئەمەش یان ئەبوو لە دوای مشورخواردنو گەڕانو سۆراخێكی زۆر لە سەرچاوەیەك بە پارە بكڕدرابایە، یان لەسەر دەستی هاوسەنگەرەكانی

خۆی لە شەڕێکی پێشمەرگانەدا دەسکەوتی چالاکی‌یەك بولیە. بۆیە لەم ماوەیەدا هەندێ جار پێشمەرگە کە لە هێڵی پاشەکشێی مەفرەزەکەدا دانرابو هەندێ جاری دیکەش دەبرایە نێو گۆرەپانەکانی شەڕەوە. بۆ ئەوەی لە لایەکەوە وەك چۆن ڕابهێنرێ لەگەڵ ژیانی نوێی پێشمەرگایەتی سەردەمەکە، ئاهواش لە ڕووی بەکارهێنانی چەك و ماتۆڕی تەقەو تۆقی چالاکی و شەڕکردنەوەچاوی بکرێتەوە.

ڕۆڵی ڕابەر سیاسی مەفرەزەیەك، بێجگە لە بەشداری کردن لە چالاکی‌یەکان داو دانەبڕان لە هێزەکەی، چەند ڕاسپاردەو ئەرکێکی ڕێکخراوەیی لەسەر شان بوو، کە ئەبوو وێڕای ئەوەش لە کات و شوێنی جیاجیادا پێیان هەڵبسێ، لەوانەش:-

- ئەرکی پەروەردەکردن و پێگەیاندن و وشیارکردنەوەی پێشمەرگە، لە جۆری سیاسەت و هەڵوێست و ئامانجەکانی (ی.ن.ك) و گەیاندنی ڕێنمایی و بۆچوون و گۆڕانکاری و بڕیارەکان بە دەستەکەی، لە دیاری‌کردنی دوژمنانی سەرەکی و ناڕاستەوخۆو هی شاراوەو دەرەوە. لە وەرگرتن و پەیداکردن و دابەش کردنی بڵاوکراوەو خوێندنەوەو هەڵسەنگاندن و شیکردنەوەو تاوتوێ‌کردنی بابەت و ڕۆشنبیرکردنی هەڤاڵانی پێشمەرگە.لەمەرجی پاراستنی دەم و دەست و داوێن پاکی و خووڕەوشت و بەهاکانی شۆڕش و پێشمەرگایەتی و پیرۆز ڕاگرتنی داب و نەریتی کۆمەڵانی‌خەڵك و بەکەم تەماشا نەکردنیان و هان دانی پێشمەرگە بۆ گیان لەخۆبوردویی و کارکردن لەناو جەماوەرداو بەو پێیەش لەکاتی پێویست دا بەهانایانەوە بچن.

- بە کۆکردنەوەی زانیاری پێشمەرگەیی لەسەر ڕەبایەو شوێن و جێگاو بوونی بارەگاکانی دوژمن لە ناوچەکەداو هەوڵی دیاری کردنی ژمارەو چۆنیەتی لە دابەش بوون و ڕادەی بەرگری لە کاتی شەوداو پێزانینی جۆری چەکەکان و شوێنی تەواوی ئەفسەرو سەربازانی یەکەو پیاواتی جەیشی ناشەعبی و مەفرەزەی جاش. هەروەها وەرگرتنی بەرواری مۆڵەت و ماوەی ڕۆیشتن و گەڕانەوەو هۆکاری بەڕێ کردن و گواستنەوە. بەهۆی هاتوچۆو تێکەڵاوبوونی خەڵکی ناوچەکە لەگەڵ چەکدارەکانی میری‌دا.

– لە نووسینی ڕاپۆرتو شیکردنەوەی خاڵی لاوازو بێ هێزیی لایەنی پێشمەرگەیی‌و ئیداریی بۆ ئۆرگانەکانی سەرەوە، لەسەر توانای شەڕکردن‌و پەلاماردان‌و بەرەنگاربوونەوەو ڕووبەڕو بوونـەوەی سـوپایی‌و ڕێگرتـن لـە دیـاردەی نـامۆو سـەرهەڵدانی کێشـەو ململانـێ لـەکاتی خـــۆیدا، بـــە ئاگادارکردنـــەوەی نـــاوەندی بـــەرزتر لـــەو بارەیـــەوە.
– لـە لێکۆڵینـەوەو بـەدواداچوونی پیـاوی سـیخوڕو گومـان لێکـراوو گـوێ لـە مسـتو پڕوپاگەندەچی‌و بەعسـی‌و بـەتاڵ کردنـەوەی واتـەوات‌و دڵەڕاوکێ‌و پشـت ڕاسـتکردنەوەی هەواڵ‌و مقۆمقۆ لەناو گوندنشینەکان دا، بە لێپێچینەوەو ئاگادارکردنەوەو سەرنج ڕاکێشانی خـەڵکێکی بانگەشـەچی‌و لـەرزۆك لـە شـڵەژاندن‌و تێکـدان‌و نائاسـایی کردنـی بـارودۆخی ئاوایییەکان دا.
– بە شەو گەڕان گوند بە گوندو ئەنجام دانی کۆبوونەوەو وشیارکردنەوەی خەڵك، لە بـاس کردن‌و ڕوون کردنەوەی ڕێبـازی شـۆڕش‌و ئامانجـە دوورونزیکـەکانی (ی.ن.ك)و بـەوەش لـە خەبات دا کە هـەموو جوتیـاران‌و زەحمـەت کێشـان‌و کرێکـاران‌و ڕۆشـنبیران‌و کاسبکاران‌و چین‌و تاقمە شۆڕشگێڕو نیشتمان پەروەرو تێکۆشەرەکان لەخۆ دەگرێ‌و لە ئامانجـەکانیدا خەون‌و ئاواتی هەموو لایەکی تێدا ڕەنـگ ئەداتـەوەو لـەناو شۆڕشـە ڕزگاریخوازەکـەیان دا ئەبن بە هاوپەیمان‌و دروست کەری بڕیارو بەشەبرای خەم‌و پاڵپشتی یەکتری‌و خـاوەن یـەك وتارو چەندین لەو تایبەتمەندی‌و مۆرکەو بەهاو ڕەگەزانـەی کـە ئەتەوەیـەك ئـەیان بەسـتێ بەیەکـەوە. دوای ئـەوەش بـە وەسـتان‌و گـوێ گرتـن لـە سـکالاو تێبینـی ئامـادەبوان‌و بــە کردنەوەی دەرگای سەرنج‌و پێشنیارو پرس‌و ڕا پێکردن بـۆ دۆزینـەوەی باشـترین شـێوەی چارەسەری کێشەو پێداویستی‌یەکانیان لە گوندەکەداو بەرچاوکردنی بیرو داخوازی خەڵك لـەکارکردن داو لانـەدان لـە پـەیڕەوی ماسـی نـاو ئاوەکـەو لـە وەرگرتنـی وانـەو پـەندو ئامۆژگاری‌و فێربوون لە جەماوەرەوە.
– لە سەرپەرشتی‌و هەڵسوڕاندن‌و بەسەرکردنەوەی هەڤاڵانی ڕێکخستن لـە ناوچەکـەدا، بـە ڕێنوێنی تازەو پوخت کردنی هەنگاوەکان‌و سەنگین تر کردنی زمانی ئیش کردن‌و کرانەوەو کردار، بە خۆبواردن لە گۆشەگیری‌و ساردنەبوونەوە لـە کۆشـش‌و تەقـەلاو جێبـەجێکردنی

ڕاسپاردەو ئەرکو داواکاری‌یەکانی ڕێکخستن. لە چوونە ناو خەڵکو پتەو کردنی ڕیزەکانو برەو پێدانیان، بە هەڵ نەچوونو دڵنەچوون لەکاروکردەوەو ڕەفتاردا، بە ڕەت کردنەوەی ڕاڕایی‌و کۆکردنەوەی توانا‌و وزەی ڕەنجدەران لەدەوری خۆیان. کە ئەمیشە لە ڕاپەڕینو بزوتنەوەی چەکداری‌دا هەوێنی تێکۆشەرانەی کورد بوون بۆ شۆڕش‌و سەرفرازی‌و خۆبەخت کردن. هەروا لە هەوڵی فراوان کردنو زیاترکردنی قەبارەو جۆرو شێوازی پەیوەندی کردن بە جەماوەرەوە، لە ڕێکخستنو پەیداکردنی زۆرترین ئەندامو دۆستو لایەنگر لە کەسایەتی نیشتمان پەروەرو خەڵکانی ڕەنجدەرو ڕابردووی ڕوون، بە ئاقاری زوو بە جەماوەری کردنی شۆڕشەکە لە لایەکەوەو ڕیشە داکوتان لە بنجو بنەوانی کۆمەڵ بە ئاراستەی شۆڕشێکی درێژخایەنو دوور مەودا لە لایەکی ترەوە.

- بە قوڵ کردنەوەی گیانی پەیوەندی‌و هەڤاڵینەی ڕێکخستن لە نێوان گوندو شارەکان دا، لە ڕێی ناساندنو بەیەکتر ئاشناکردنو نامەنووسین بۆ کەسایەتی‌یە شۆڕشگێڕو ئازادی‌خوازەکانی شارو شارۆچکەکانو ئەو خەڵکە ناسراوو کوردپەروەرانەی لە ئەنجامی ئیش کردنو هاوڕێی خوێندنو تێکەڵاوی‌یەوە ساغ ببوونەوە کە شایستەی هێنانە ناو ریزەکانی ڕێکخستن بوون. بەو پێیەش ڕابەر سیاسی ببووە ئەڵقەی گرێ دانەوەو لەیەك نزیك کردنەوەی کۆمەڵانی خەڵکو ئەندامانی چەندین شانە لە ڕێکخستنە نهێنی‌یەکانی دەرەوەو ناوەوە. بۆ ئەوەش ئاواییەك ئەبووە ڕایەڵی دوو سەرە، لە شارەوە بۆ هاوکاری کردنو ناردنە دەرەوەی تێکۆشەرانو بەرزکردنەوەی ڕاپۆرت لەسەر کارو جموجۆڵی هەڤاڵانو نوێترین ئاماژە بە جۆرو قەبارەو دەرچوونی سیاسەتەکانی بەعس‌و خاڵی پەرینەوە لە گواستنەوەی کۆمەکو پێداویستی‌یەکانی پێشمەرگە بۆناوچە ڕزگارکراوەکانو، لە گوندەوە بۆ هەواڵەکردنو ناردنو بەڕێ کردنی بڵاوکراوەو نامیلکەو کتێبو تابلۆو پۆستەری شەهیدانو دەنگو باسی شۆڕش‌و چالاکی‌یەکانی پێشمەرگەو بەیاننامە لەسەر ڕوون کردنەوەی بارودۆخ‌و یادکردنەوەی کارەساتو بۆنە گشتی‌یەکانو بردنو گەیاندنی تفەنگو دەمانچەو نارنجۆکو تەقەمەنی‌و تفاقی شەڕکردنو نامەو نووسراوی سەرنج ڕاکێشانو فڕێدانیان لە نزیك ماڵی خۆفرۆشانو بنکەو بارەگاکانی بەعس.

- بوون بە ناوبژیوانو ڕێکخەری کاروباری گوندنشینەکان. لە چارەسەرکردنو لابەلاکردنەوەی ململانێو کێشەی بەردەوامی زەویو ئاوو پووشو پاوانو لەوەڕگاو بەرهەم هێنانی زەوی بەراوو دێمو ئاژەڵداریو لە چوونە ناو دەغڵو باخو ڕەزو دارستانو سنوور بەزاندنی یەکتریو لە نانەوەی شەڕو ناکۆکی لەسەر شکارتەو خەڵەو خەرمانو گێرەو بەباکردنو شیناییو جۆماڵو مەرەزەکردنو دوایی هێنان بە گێچەڵو قەیرانی درێژخایەنو دانانی هێڵی جیاکەرەوەو قایل پێکردنیان بە سنووری دیاری کراوەوە. لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە بوونی بە خاوەن مەرجو بڕیاری پەسەندکراو لە لای گوندنشینەکان، بۆ بەربەست کردنو دامرکاندنەوەی شەڕو ڕکابەری خێڵو بنەماڵەو جەنگی دراوسێتیو ڕەت کردنەوەی پەلامارو دەست نەدانە چەکو ئامۆژگاریکردن بۆ پێکەوە ژیانو نەڕووژاندنی یەکتریو دانەبڕان لە ڕەوشو گۆڕانکارییەکانی سەردەمو کوردەواری نوێ.

- لە هەوڵی دابین کردنی پێداویستیو خەرجییە ئیداریو پێشمەرگەییو سەربازییەکانی شۆڕش. چی لە سەرچاوەی کۆمەکو پیتاکی هەڤاڵانو دۆستو لایەنگران بە پلەی یەکەم، چی لە ئەنجامی پەیوەندی کردن بە دەیان کەسێتیو ناوەندو چینو پێکهاتەی توێژە کۆمەڵایەتییەکان لە دەوڵەمەندو بازرگانو بەڵێندەرو ئەندازیارو پزیشکو پارێزەرو خاوەن پرۆژەو کارگەی بەرهەم هێنانو کێڵگەی کەویزارو زەوییوزاری بەرهەمو دانەوێڵەو ڕەزوباخو جەنگەڵو یارمەتی پیشە خۆماڵیو دەستییەکان بە پلەی دووەم. لەپاڵ مشورخواردنی پێداویستییەکانی پزیشکی لە داوودەرمانو دەرزیو گولاجوحەبو پەیداکردنی بەنجو ئامرازەکانی نەشتەرگەریو فریاکەوتنی سەرەتایی بۆ چارەسەرکردنی برینو وەستاندنی خوێنو دەرهێنانی گوللەو پارچەو ژەهراوی بوون بە دووپشکو مارو مێروو پێوەدانو سەرمابوونو تاو سکچوونو ڕشانەوەو هەوکردن.

- بە وردی ئاگاداربوون لە ڕەوشی شارەکانو پەی بردن بە سیاسەتەکانی بەعس. لە دانانی نەخشەو ئەنجام دانی جەوروچەوسانەوە دەرهەق بە کۆمەڵانی خەڵک لە تۆقاندنو دەربەدەرکردنو ڕوانانو لێکۆڵینەوە لەسەر گوزەرانو بەڕێوەچوونی ئاسایشو تێبینی کردنی بازاڕو نرخی کاڵاو شتو مەکو بارودۆخی ئابووریو بژێوی ژیانی نیشتەجێی

شارەکان لە خەڵکی ڕەنجدەران و مووچەخۆرو کاسبکاران و جۆری مامەڵەکردن و جمووجۆڵی ڕۆژانەی دەزگا ئەمنی و داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێم و تێکڕای ئەو ڕوداوە گرنگ و گۆڕانکارییانەی کە لە نێو شارو شارۆچکەکان و دەوروبەرەکەی ئەهاتنە گۆڕێ و بەدەست هێنان و فۆتۆکۆپی کردنی ئەو ئامارژەو نووسراوو بڕیارانەی کە پەیوەندییان بە دۆزی کوردان و شۆڕشەکەیەوە هەبووە، پاڵپشت بەبەری تەقەلاو کۆششی هەڤاڵانی ڕێکخستن لە ناوەوەو دەرەوە.

ئەو مەرجانەش کە پێویست بوون لە ڕابەر سیاسی مەفرەزەیەک دا هەبن، بریتی بوون لە..

- بوونی خوێندەواری پێویست.
- پێشینەیەکی پاک و ڕوونی لە ڕابردوودا هەبێت.
- پێشتر لە یەکێك لە ئۆرگانەکانی ڕێکخستن دا کاری کردبێت.
- پشتگیری ڕێکخراوەیی هەبێت لەو سنوورەی کە تیایدا نیشتەجێ بووە.
- وەك سەرەتایەك بە یەکێك لە تاقیکردنەوەکان دا تێپەڕی بێت.
- یەکێکی ناسراو بێت و ڕەوشت و ناوبانگی لەکەدار نەبێت.
- لە ڕووی کەسایەتیەوە هێمن و خاکی و لەسەرخۆ بێت.
- تەمەنی لە ڕاست ئەو لێپرسراوێتییە گونجاو بێت.
- کەسێکی وشیارو چاوو مێشك کراوە بێت.
- لە توانایدا هەبێت کۆڕو سیمینار ببەستێ.

ئەگەر لە بنەمادا جەنگی پارتیزانی بریتی بێ لە لێدانی کوتوپڕی هێزەکانی دوژمن و کشانەوەی دەستبەجێ لە مەیدانی شەڕەکەوە بۆ قوڵایی دورترین ناوچەو خۆ لابردن لەشەڕی بێ بەرنامەو شکست نەهێنان بە مەفرەزەیەکی پێکهاتەی بچووك، ئەوا نموونەکەی لە کوردستانی بەشی باشوردا زۆر جیاوازتر بووە لە ئەزموونی گەلان و بەش و پارچەکانی تری کوردستان. چونکە لە لایەکەوە بەهۆی فراوانی ڕووبەری دەشتاییەکان و نەبوونی حەشارگەی سروشتی لەناوچەکانیداو کەمی چیای سەخت بۆ داکۆکی کردن و سەرباری چەندین جادەی قیرتاوکراوی جۆراوجۆر کە بەسنوورەکانیدا تێپەڕیوون، لە پاڵ بوونی

باڵادەستی سوپایەک لە ڕووی ژمارە زۆریی هێزی پیادەو چەکی ئاسمانیو زەمینی لە بەرهەنگاربوونەوەی مەفرەزەکانی پێشمەرگەدا لە لایەکی ترەوە، لە توخمە ئاڵۆزکاوەکانی بەردەم جوڵانەوەکەو گەشەنەکردنی چالاکییەکانی بووە.

دەستەیەکی پارتیزان بەشەو، ئەبوو لە ماوەی ڕۆیشتنو جێگۆڕکێ لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، پێشمەرگەکانی یەک لە دوای یەک ملی ڕێگاکەیان بگرتبایەتە بەرو هەتا سێبینی چاو لەو تاریکییە بڕی بکردبایە، مەرج بوو ئەو ئەوانە بپارێزنو لە پێشو پیاتی یەکتری ئاگادارینو هەرکە دابڕان لەو شێوازەیە ڕووی دابایە، بە دەنگێکی بیستراوی هەقاڵی پێشەوە ڕێک رایەوەستابانایەو هەر یەکێک لە ڕاست خۆیەوە پابەند بوایە بە ساوە دەست پێشان کراوەکەیو لەگەڵ ناردنی ئاماژەی گەیشتن لە دوایین کەسەوە، وەک جاری پێشو هەموو پارتیزانەکان بەڕێ بکەون. بەڵام ئەو ماوەیە لە دەوراتی ڕۆژدا فراوانتر ئەبووەوە، بە ڕادەیەک سێتین بە چاو بۆ هەڤاڵی پێشو دواوە ئاستەم ئەبوو.

بەر لە ئەنجام دانی هەر چالاکییەک فەرماندەی مەفرەزەکە زانیاری تێروتەسەلی لەسەر قەبارەو پێکەی سوپایی دوژمن لە ناوچەکە کۆئەکردەوەو لە پاشان ئەو بنەماو ڕەگەزە جوگرافیاو عەسکەرییانەی لەناو پرۆسەکە دیاری ئەکردو لەو پێناوەش دا هەرچی توانایەکی پێشمەرگەییو ڕێکخراوەیی هەبووە، ئەیخستە گەڕەوەو لە دانانو جێبەجێکردنی پلانی شەڕو پاشەکشێو بەرگریکردن دا، باشترین نموونە بدات بە دەستەوە. بەفراوانترین دەسکەوتو بە کەمترین زیان بگەڕێتەوەناوچەو سەنگەری چالاکییەکانی خۆی. ئەو چالاکییانەش لەم تەوەرانەدا خۆیان دەبینییەوە:-

## ١/ ڕوون کردنەوەی ڕێبازی شۆڕش.

ئەم چالاکییە، یەکێک بووە لە دیارترینو بەرباڵوترین هەڵمەتی وشیارکردنەوەو بێدارکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵک لەلایەن مەفرەزە سەرەتاییەکانی یەکێتییەوە، چونکە لەم قۆناغەدا ڕەوشی کوردستان لە ئەنجامی هەلومەرجە سیاسیو عەسکەرییو سروشتی جوگرافیاکەیەوە، شۆڕشەکەی وا لێ کرد بوو هەتا ساڵی (١٩٨١) هێشتاکە خۆی بە

سەرەتاکانی ڕوون کردنەوەو خۆناساندن و شیکردنەوە بە ئامانجەکانیەوە بەبەستێتەوە. بەڵکو تا ئەو کاتەی شۆڕشێکی سەرتانسەری نەتەوەیی بە نیشتمان پەروەران و زەحمەتکێشان و ئازادیخوازان ئەگیرسێتەوە، لایەنی کەم کۆمەڵانی خەڵك بە ڕێبازو دروشم و خواستەکانی شۆڕشەکە ئاشنا بکات.

پرۆسەکەش پاش ئەوەی ئەندامانی مەفرەزەکە بە دابراوەکانیەوە لە شوێنی دیاریکراودا کۆئەبوونەوەو لە ڕێگادا بەرەو چالاکی‌یەکە (٢) پارتیزان بە چەکی ناوەنجی و قورسەوە بۆ تێبینی و چاودێری کردنی سەرجادە کە بەڕێ ئەکەوتن، ئینجا ئەودوای هێزەکە دابەش ئەبوون بە ئاراستەکانی قۆڵی ڕاست و چەپ و ناوەڕاست و دوو دیدەوانەکەش هێڵی پاشەکشێ‌یان لە یەکێك لە بەرزاییەکانەوە بۆ مسۆگەر ئەکردن. بۆ ئەم مەبەستەیش گونجاوترین شوێن و جێگای بۆسەنانەوە بریتی‌بوون لە ڕێی پێچاوپێچی شاخ و نشێویی ڕێگاوبانەکانی ڕۆیشتن و هاتنەوە کە مەرج بوو مەودای تەقەکردنی ڕەبایەکانی دوژمن لەبەرچاو بگیردرێن. ئەو دەم تێکڕای ئۆتۆمبیلەکان لە قۆڵی ڕاست و چەپەوە ڕادەگیران و بەوردی و دوای دڵنیا بوون لە پشکنینی ناو ئۆتۆمبیل و ناسنامەی سەرنشینەکانی، بەرەو لای هێزەکەی ناوەڕاست بەڕێ ئەکران و لەوێ لەلایەن ڕابەرسیاسی مەفرەزەو فەرماندەی مەفرەزەکەوە پێشوازی‌یان لێ ئەکردن و داوایان لە خەڵکە ئامادەبووەکە ئەکرد کە(هەر یەکێك لەڕاست خۆیەوە دابنیشێ و گوێ بگرێت لەوەی کەنیاز لەم کۆبوونەوە جەماوەرییە چی‌یە و لەپاشان هەریەکێك ئازاد ئەبێت بەئاراستەی ئەو ڕێگایەی کەئەیەوێ بیانگرێتە بەر).

ئەو بابەتانەی کە ئەبوون بە پێوەدانگی قسەوباس و ڕوون کردنەوەی ئامانجە دوور و نزیکەکانی شۆڕش، پێکهاتبوون لە (زەمینەو بایەخ و گرنگی لە دلیك بوونی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و سەرلەنوێ بەرپاکردنەوەو هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی چەکداریی و پووچەڵ کردنەوەی پیلانەکانی کۆچ پێکردن و تواندنەوەو سڕینەوە لەناو بۆتەی دانیشتوان و ڕەگەزو بنەماڵەو خێڵە جیاجیاکانی عەرەبی عێراق داو لە ئەستۆنانی خەم و ئازارو مەینەتی و داواکاری‌یەکانی نەتەوەیەك کە هەتا سەر ئێسقان ئێسك و پروسکی لە ڕاست ئەو مافانەدا وردو خاش دەکرێن و بۆ ئایندەیەك سەروماڵ و خوێن و قوربانی

دەبەخشیٚ هەتا کوردو کوردەواری‌و گەل‌و نیشتمان‌و کولتورو زمان‌و فەرهەنگ‌و شارستانی‌و میٚژووەکەی بپاریٚزیٚ‌و لەژیٚر بارو چەکمەی داگیرکردن‌و بەزۆرلکاندن‌و کاول کردن دەرباز بکریٚت‌و بۆ هەتاهەتایە کورد هەڵواسین‌و خویٚن مژین‌و دیکتاتۆری بەسەر سەریەوە نەهیٚڵیٚ‌و لە جیٚگایان دا گەلیٚکی ئازادو دەستڕۆیشتوو، خاوەن حکومەتی خۆماڵی‌و بەڕیٚوەبردن، بە یەکیٚك لە شیٚوازەکانی سیستەمی مافی چارەی خۆنووسین شاد بیٚتەوە). ئەمەش لە کاتیٚك دا کۆبوونەوەکە لە ماوەی کەمتر لە نیو کاتژمیٚردا بەڕیٚوە دەچوو، خاڵە سەرەکی‌یەکانی پرۆژەو بەرنامەو ئامانجە گشتی‌و تایبەتی‌یەکانی یەکیٚتی نیشتمانی کوردستان بە پووختی بۆ ئامادەبووان شی ئەکرانەوەو ئەوساکەش مەرجی بڵاوە پیٚکردنیان لەبەردەم ئاپۆرەی خەڵکەکەدا دائەنا، کە پیٚویست بوو لە کۆتایی ڕیٚ‌و ڕەسمی پاشەکشیٚی مەفەرزەکەدا ئەوانیش بەڕیٚ بکەون. بە تایبەتی بۆ هەردوو پارتیزانی سەر باڵەکە وەك دواترین ویٚستگە.

حکومەتی عیٚراق، لە سەروبەندی ئەنجام دان‌و بەڕیٚوەچوونی چالاکی‌یەکەدا، چەندین کارو کردەوەی سەربازی‌و ئەمنی‌و سوپایی دەست پیٚدەکردو بە دەیان ڕیٚنوێنی‌و نووسراوی سەرنج ڕاکیٚشان‌و قەدەغەکردن‌و ئامۆژگاری بۆ هیٚزە چەکدارەکانی دەرئەکردو داوای لە یەکە سەربازی‌یەکان‌و پۆلیس‌و ئاسایش‌و حزب‌و فەرماندەیی‌یەکانی جەیشی ناشەعبی ئەکرد کە هەرکەس‌و ناوەندو گروپیٚکی دیاری‌کراوی دەوڵەت پابەند بیٚت بە ڕەوشی نائاسایی‌و جیٚبەجیٚکردنی ڕاسپاردەو ئەرکەکانی سەرشانیان بە دەقی فەرمانەکانی سەرەوە. ئەو کارو کردەوە سەربازی‌و ئەمنی‌و سوپاییانەی کە ڕژیٚم پیٚی هەڵدەسان، بریتی بوون لە:-

- ڕیٚ داخستن لەبەردەم هاتوچۆی ئۆتۆمبیلەکان‌و کۆنتڕۆڵ کردنی ڕیٚگای دووسەرە لە نیٚوان هەردوو ڕەبایەکە کە شوێنی نانەوەی بۆسەکەیەو لە پاشان خەڵکەکە ناچاری گەڕانەوە ئەکریٚ‌و بە چارەسەرکردنی سەربازی هەڵدەسن.
- بە گل دانەوەی سەرنشینانی ئۆتۆمبیلەکان‌و ئەو ئەناسراوانەی کە هەڵگری هەواڵەکەن‌و دەسبەجیٚ لیٚکۆڵینەوەیان لەگەڵدا ئەکریٚ‌و ئەوساکەیش بە دوورین ناوچە گومان لیٚکراوەکە ئەخریٚتە ژیٚر چاودیٚری وردەوە.

– مەفرەزەی هاوەن لە نزیکترین ڕەبایەوە هەڵدەستێ بە تۆپ باران کردنی ئاپۆرەی خەڵکەکە. بۆ ئەوەی لە لایەکەوە دەریبخەن کە ئەوان لە خوێن ڕشتن‌و کوشتار هیچ جیاوازی‌یەك ناکەن لە نێوان کوردێکی چەکداری شاخ‌و یەکێکی بێ لایەن. لە لایەکی ترەوە بۆ ئەوەش لەمەودوا پەند بە گەشتیارانی تر دەدەن کە هەر جۆرە لادان‌و کۆڕ بەستنێکی نائاسایی لەسەر جادە گشتی‌یەکان ڕووبەڕووی تیاچوونیان ئەکەنەوە.

– لەگەڵ بڵاوپێکردنی ناوچەی کۆبوونەوەکەدا، ڕێ‌و ڕەسمی توند پیادە ئەکرێ، پاش ئەوەی ئۆتۆمبیلەکان لە دوو لاوە ڕێگایان لەسەر دڵنەخرێ‌و لە ناسنامەی یەکەیەکەی سەرنشینەکانی ئەکۆڵرێتەوە، پرسیاری ئەوەیان لێ ئەکرێ کە ئایا ئەو کەسانەش کێ بوون لە ئاخاوتن‌و دەم‌و دوودا هاوسۆزبوون‌و لەگەڵ بیروڕایاندا یەکیان دەگرتەوە.

– کۆپتەری بارهەڵگرو جەنگی لە کاتی خۆیدا تەرخان ئەکرێ بۆ ڕاوەدونانی مەفرەزەکەو هەتا ئەکرێ ئاوایی بە ئاوایی‌و ناوچە بە ناوچە بە شوێنیانەوە ئەبن‌و هەر کە بەرچاویان ئەکەون دوای هێزی سەربازی‌و کۆپتەری زیاتر ئەکەن.

– شوێنی چالاکی‌یەکە ئەکرێ بە ڕەبایەی (جێگیر) یان (گەڕۆك)و کوولستراوە بە ڕۆژو بە درێژایی ئەو ڕێگاوبانانەی ڕۆیشتن‌و هاتنەوەش چەندین ڕەبایەی دیکە لەسەر باڵەکان قوت دەکرێنەوە.

– هەر یەکێك لە ڕەبایەکان (دۆشکا)یەکی سێپایەی بۆ زیاد ئەکرێ‌و ئەبوونە سەرباری ئەو هەموو چەکانەی تر کە بریتی بوون لە(ئاریی‌جی، بی‌کەی‌سی، هاوەن(٦٠، ٨٢، ١٢٠)ملم، فاز قەنناس، ئاریی‌کەی، میکاریۆف، سەمینۆف، کلاشینکۆف). هەروەك فەرمانی پێشوەختەو پابەند نەبوونیان بە بڕیاری نوێی سەرەوە پێدرا کە بۆ چارەسەرکردنی هەر شێوە قەرەباڵغی‌و جۆرێکی نائاسایی کۆبوونەوە یان ئەو دیاردانەی کە سوسەی گومانیان لێ ئەکرێ لەسەر جادە گشتی‌یەکان، دەست ڕێژو تەقەکردن بە کراوەیی بمێنێتەوە.

– بۆ ڕۆژی دوایی هێزێکی هاوبەش لە تێکەڵەی سوپاو (رفیق حزبی) شارۆچکەکان‌و بە پێشڕەوی‌و چاوساغی‌کردنی جاش‌و جەیشی ناشەعبی‌و بە پاڵپشتی چەندین (مدرعە)و ماشێنی هەڵگری سەربازو کۆپتەری جەنگی لە ئاسمانەوە، هێرشێکی بەرباڵاوی کوتەو پڕو لە چوارقۆڵەوە بۆ سەر ناوچەکە دەستی پێدەکردو تەنانەت دوو تا سێ ڕۆژ لەگەڕان‌و پشکنین‌و مانەوە بەشەو ناوچەکەیان بەجێ نەدەهێشت.

– یەکەیەکی ئامادەباشی دەستوبرد لە (مدرعە)و بارکردوو بە ژمارەیەك سەربازی مەشق پێکراوو پشت بەستوو بە دەزگای بێ تەلو وابەستە بە هۆبەی پرۆسەکانی بنکەی لیواکانەوە دروست ئەکرێو پارێزگاری ئەم پەڕی دەروازەی چوونە ناو شارۆچکەکانو دەرچوون لێیانو هێوەرکردنەوەی نائارامیو بەرپەرچ دانەوەی هەر هەڵمەتێکی ناکاوی پێشمەرگە لەوەختو ناوەخت دا ڕوبەڕوی یەکەمین لێپرسراوێتی ئەبوونەوە.

– پێویست بوو سوپا هەموو بزاوتێکی خۆی لە کاتی مۆڵەت وەرگرتنو گواستنەوەدا بە شێوەی (قافلە)ی عەسکەری هاتوچۆ بکەنو لە ڕێگادا بە مەفرەزەیەکی چاك کردنەوەی ئۆتۆمبیلو بە یەکەیەکی گورەپانی پزیشکیو لە پێشو پاش بەڕێوەچوونی کاروانەکەش دا بە (٢) مدرعەو بە کوپتەر لە بەرزاییەوە پێشڕەویو پاڵپشت بکرێن.

– دەرکردنی بڕیار بە قەدەغەکردنی هاتوچۆی پیاوانی حزبو چەکدارەکانی دەوڵەت لە پاش تێپەڕبوونی کاتژمێری (٢)ی دوای نیوەڕۆوە.

– ئەبوو (سەیتەرە)کان لەگەڵ ئاوابوونی دوا تەلیسمی خۆردا دابخرێن تا بە ڕاسپاردەی نوێ ئاگادار ئەکرێنەوە.

لە ژێر پاڵەپەستۆی چەندین بڕیارو هەژموونی عەسکەرتاریەت دا، کوردستان پێی نایە کەشێکی سەربازی ترو ژیانی خەڵکەکەی دژوارتر کردەوە. بەڵام بە کردەوەش هیچیان لە سەنگو بایەخی ئەم چالاکیەی کەم نەکردەوەو نەیانتوانی، نە کۆنترۆڵی ڕێگاویانەکانو تێپەڕبوونی هاووڵاتیانو هێزو پیاوەکانی خۆیان پێ بکرێ، نەتوانییان لەمپەری سوپایی بخەنە بەردەم ئەنجام دانی پرۆسەکەو تەقەلاکانی مەفرەزە سەرەتاییەکان هەڵلوشن. تەنانەت هەندێ لە ڕەبایەکان کەوتنە سازش کردنو جۆرێ لە دامەزراندنی پەیوەندیو چاوپۆشی کردن لە نانەوەی بۆسەو ناردنی بەڵێن نامە بەخۆگونجاندنو تەقەنەکردن لە دانیشتوانی گوندنشینەکان.

بەرهەمی چالاکیەکەش ئەم دەسکەوتانەی لێ ئەکەوتەوە:–

– بە دەسگیرکردنی پیاوانی سیخوڕو جاشو خۆفرۆشی نیشتمان کە هەرگیز بیریان لە تۆڵەی تاوانەکانیان نەئەکردەوە لە ئازاردانو بەگرتن دانی خەڵکێکی نیشتمان پەروەر کە باجەکەی سەری خۆیان ئەبێ.

- زۆر لە بەڵگەنامەی پۆلیس‌و ئیستیخباراتی‌و نهێنی سوپایی ئەکەوتنە بەردەست. هەم گەواهی بدەن بە ناسنامەی ژمارەیەکی تر لە هاوکارو شوێن کەوتوانی ژێربەژێرو ئاشکراکانی ڕژێمەکە، هەم سەرکردایەتی شۆڕشەکەش بۆ سیاسەتە دوورو نزیکەکانی بەعس خوێندنەوەی پێشوەختیان هەبێ.

- ئەڵقەلەگوێیانی سەردەمەکەی ئەمێنایە سەر ئەو باوەڕەی کە بە خۆیان دا بچنەوەو چارەنووسی خۆیان بە مان‌و نەمانی بەعسی دەسەڵاتدار نەبەستنەوە، دەنا زوو یان درەنگ بەر سزای گەل‌و شۆڕش ئەکەون.

- نموونەیەکی حاشاهەڵنەگر ئەخاتە بەردەست کە ئەکرێ بە ژمارەیەکی کەمەوە لە بەرامبەر هێزێکی زەبەلاح دا بجەنگێ‌و دام‌و دەزگاو بنکە سەربازی‌یەکانی دەوڵەت بخاتە بەر مەترسی‌یەوە.

- گەورەیی سوپایەك بچووك بکاتەوە کە خاوەنی نوێترین تەکنەلۆجیای عەسکەری‌و زۆرترین دیسپلینی سەربازی بێت‌و لە ڕاست دەستەیەکی پارتیزانی گەڕۆك‌و بێ تفاق‌و بەرگری سەرەتاییەوە دۆش دامێنێ، لە کاتێك دا دزە بکاتە نزیك ترین قوڵاییەکانی ئەوەوە.

- قسەوباسی شۆڕش‌و خەبات‌و بزووتنەوەی کوردایەتی زۆر بەخێرایی لە نێو شارەکان دا ئەبیسترایەوە، چالاکی‌یەکان ئەبوونە بابەتی ڕۆژو لەسەر جادەو بنکەکانی تەندروستی‌و خوێندنگاو فەرمانگەکانی دەوڵەت دەماودەم بڵاوئەبوونەوە.

- مژدەی ئەدا بە تێکۆشەرانی دێرین‌و لاوە خوێن گەرمەکانی نەتەوە کە بۆ ئەوانیش زەمینە لەبارەو سەنگەرەکان لەسەر دەستی ئەوان دا گەرمتر ئەبنەوە.

- خەڵکێکی هان ئەدا بۆ سۆراخی پەیوەندی‌و کارکردن لە ناو ڕێکخستنەکانی (ی.ن.ك)دا، ئەو ڕێکخراوە مێژووکردەی کە زادەی سەردەمی پێداویستی‌یەکانی کورد بوو. ئەگەرچی تواناکانی کەم‌و چالاکی‌یەکانی سنووردار بوون، بەڵام لە ڕووی سیاسی‌و بنکەی جەماوەری‌یەوە ڕە گی ڕێکخراوەیی لە هەموو شارو شارۆچکەو گوندێکی کوردستان پەلی هاوێشتبوو.

- بیرکردنەوەی کۆمەڵگا بگۆڕێ لەو ساردی‌یەی کە تێی کەوتبوو، گوایە ئەستەمە لە ئایندەیەکی دوورونزیك دا لە پاش ئەوەی جوڵانەوەی کورد ئەو ڕوداوانەی ئەیلولیان بە

خۆیانەوە بینی جارێکی ترو وا بە ئاسانی هەلێکی بابەتیو پشتگیرییەکی مرۆییان بۆ بڕەخسێنێ.
– شکۆمەندیو سام بۆ کوردو نیشتمانەکەی بگەڕێنێتەوە.



## ٢/ مین چاندن

مین دانانو هەلگرتنەوە، تایبەتی بوو بە مەفرەزەیەکی شارەزاو پسپۆڕ لە بوارەکەدا. هەروەها جۆرێکی تری کەنالی پەیوەندی کردن بوو بە جەماوەرو دوژمنەوە. بە جەماوەر:– کە پێیان بلێ ئەوا مەشخەلەکەی ئاگری شۆڕش لەتاو سەندن دایەو ئەتوانرێ بە شێوەی جیاجیا دەست لەلەشکری داگیرکەران بووەشێنرێ. بە دوژمن:– کە بریتیبوو لە ناردنی نامەیەکی هەڕەشە بۆ ئەوان کە ئۆردویەکی نامۆن لەسەر ئەم خاکەو پێویستە لەسەریان لە هەموو هەنگاونانێك دا سلّ لە پاشو پێشی خۆیان بکەنەوەو بە مانەوەشیان زۆر ژیانیان لیّ تالّ ئەکرێ. چونکە بەکارهێنانی مین ئەوەندەی لە نێوان دوو سوپای تێ هەلچوودا بۆ دابڕینی جوولەو پەلاماردانی یەکترییە، نیو هێندەش لە توانایدا نییە هەڕشەیەکی سیاسیو مرۆییان لیّ بەرهەم بهێنێ، مەگەر تەنها بۆ نوچ دانی ورەو گۆج کردنی هەنگاوەکانی ئەو لایەی تر نەبێت.

بەر لە چاندنی مینەکەش، زانیاری پێویست لە ڕێگای (دووربین)ی ئاساییەوە کۆ دەکرێتەوە، پاش ئەوەی نیشانەیەك هەلدەبژێردرێ کە مەرج بوو جێگاکەی شوێنی بەکارهێنانو پێویستی ڕۆژانە بێتو لە ئاوو مەترسی ڕامالینو خوڕەمی باران بارین دور بێتو ڕێگاکەی نەکەوتبێتە سەر هاتوچۆو تێپەڕبوونی هاوولاتیانو بەو هۆیەشەوە زیان بەخەلکانێکی تر نەگەیەنێت. بۆ ئەم مەبەستەیش کەلك لە تاریکایی شەو وەرئەگیرێو یەك تا دوو کادری پرۆسەکەش بە پالپشتی مەفرەزەیەکی پارتیزانی سنورەکە یاوەری ئەکرێنو لە خالّی نزیك بوونەوەی نیشانەکەش هێزەکە دابەش ئەکرێن، یەکێکیان بۆ دەستەی

یارمەتیدەرو ئەوی تریان بۆ هێڵی پاشەکشێی مەفرەزەکە. شوێن‌و نیشانەکان بریتی بوون لە:—
— سەرەڕێگای سەرکەوتن‌و دابەزین لە ڕەبایەکان بە شێوەیەکی گشتی.
— سەکۆی ڕاهێنان‌و مەشقی سەربازی ڕۆژ.
— شوێنی وەستاندنی ئۆتۆمبیل‌و تفاقی یەدەگی ناو یەکەکە.
— دەوروپشتی ئەمبارکردنی ئاوو سووتەمەنی‌و دابەش کردنی قسعە.
— بەردەم کانی‌و تووله ڕێگاکان بۆ ڕۆیشتن‌و هاتنەوە.
— پێگەی دیدەوانی حەرەس کە ڕەبایەی ڕۆژو ناجێگیر بوون [٢]
لە پەرچەکرداری تەقینەوەکان‌و دەست‌و قاچ پەڕین‌و گیان لە دەستدانی ژمارەیەک‌و بریندار بوونی ژمارەیەکی تر لە سەربازانی بەرکەوتوو، گەورە سەرانی فەیلەقەکەی سوپای یەک بێ وەلام لێی نەگەڕان‌و کەوتنە دانانی ڕێ‌و شوێنی گونجاوو لێکۆلینەوەیەکی مەیدانی‌و تیۆریان لێ گرتەبەرو بەهۆیەکان‌و چۆنیەتی قوربانی‌یەکان‌و زەوی‌یە جوگرافی‌یەکان دا چوونەوەو هەلسەنگاندن‌و بۆچوونی خۆیان لەو بارەیەوە گەلاڵە کردو فەرمانی عەسکەری‌و ڕاسپاردەی نوێیان بۆ ڕەبایەکان بەرزکردەوە کە پێویست بوو:—
— لەگەڵ تاریک‌بوون دا هەندەسەی عەسکەری تایبەت بە هەلگرتن‌و لەناوبردنی مین هەلبسێ بە پرۆسەی پشکنینی ئەو شوێنانەی کە تەنها پەیوەندیان هەبووە بە ڕوپەڕێکی دیاری‌کراوی جموجۆلی‌یەوە.
— هەلکەندنی چاڵ بەنیوەبازنەیی لە دەوروپشتی ڕەبایەکان دا، وەک سەرەتایەک بۆ دەست بەکاربوون لە نانەوەی تەڵەو داوی پەککەستن بۆ هەنگاوەکانی بەرودوای هێرش بەرو داماڵینی سروشتی جوگرافیای دەرەوە لە ناوەوەی یەکە سەربازی‌یەکان.
— دەوری ڕەبایەکان بە تەلی دڕکاوی تەلبەند ئەکرێن.

---

[١] پێش بەرواری ئەم لێکۆلینەوەیە، چاندنی مین بۆ بەتاڵ کردنەوەی سیاسەتەکانی بەعس لە (کۆچ پێکردنی ئاوایی‌یەکانی سەر سنورو دروست کردنی ئۆردوگا زۆرەملیکان)دا پرۆسەیەکی باو بووە.
[٢] بەعس، ناوی پێشمەرگەی بە (مخرب) ناو ئەبرد.

– بە پەروەردەکردن‌و ڕاهێنانی (سەگ) لەناو ڕەبایەکان دا. ئەویش بە هێنانی وەچەیەکی هەستیارو جیاکەرەوە لە بۆن کردن‌و ڕوانین‌و هەڵمەت بردن لە کاتی شەودا، کە بتوانێ ببێتە یارمەتیدەرو ڕێپیشاندەر بۆ دۆزینەوەی نیشانەیەک کە نوقمی تاریکی بووە.

– بە تەقەکردنی تاک‌و دەستڕێژی بەربڵاو لەسەر ئاولیەکان‌و ڕێڕەوی جادە قیرتاوکراوو نەکراوەکان لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا. هەروەها بە قەدەغەکردن‌و لێدانی هەموو ئەو جوتیارانەی کە بەشەو لەناو کێڵگەو زەوییەکانیان دا خەریکی کاروباری جووت کردن‌و ئاوەدان‌و دروێنەو جۆماڵ‌و کێشەکردنن.

– بۆسە نانەوەی کتوپڕ. لە کاتێکدا جموجۆڵی نائاسایی دەبینرێ یان دەنگۆی بڵاوبوونەوەی ڕۆژێک لە تێکدەران (مخربین)[2] لە ناوچەکەدا دەبیسترێتەوە، پێویست بوو ڕەبایەکان بکەونە ئامادەباشی گشتییەوە.

– تۆپی ڕوناک کەرەوە ناویەناو هەڵ ئەدرێ.

## ٣/ دەستگیرکردنی کارکەری بیانی.

جۆرە چالاکییەکی پێشمەرگەیی تاکتیکی سەردەمەکەی بوو، بۆ ئەوەی ڕای گشتی جیهانی بورووژێنێ‌و جولانەوەی کورد بە گەلانی دوورو نزیک بناسێنێ. کە چیتر سیاسەتە کرمۆڵەکانی بەعس لە ڕاست ئەو ڕاگەیاندنەی چەواشەکردن دا خۆیان نەگرن‌و بانگەشە بریقەدارو لە خشتە براوەکانی بۆ دەرەوەی عێراق هەڵوەشێنێتەوە کە گوایە حزبی دەسەڵاتدار هەموو مافێکی نەتەوەیی‌و دڵەو دەزگای ئۆتۆنۆمی ڕاستەقینەی بە خەڵکی کوردستان بەخشیوە. کەواتە ئەگەر ئەنجامدانی هەردوو چالاکییەکەی (روون کردنەوەی ڕێبازی شۆڕش)و (چاندنی مین) ڕووەکەیان لە لێدانی زەنگی ڕاپەڕین‌و بۆ ناوەوەی سنوری نیشتمان بێت، ئەوا پرۆسەی ئەنجام دان‌و بەڕێوەچوونی چالاکییەکەی (دەستگیرکردنی کارکەری بیانی) ڕووە سەرەکییەکەی لە جیهانی دەرەوە بووە.

زۆربوونی کارکەری بیانی لە کوردستان دا، بیرۆکەی ڕفاندنی چەند ژمارەیەک لەو بیانییانەی گەڵاڵە کردو چەند ئامانجێ دەستکەوتی سیاسی‌و دەرەکی‌و ناوخۆییان لەسەر هەڵچنراو هەرێمەکانیش هەریەک لە ڕاست سنورو ناوچەی دەسەڵاتی خۆیانەوە، کەوتنە

خۆسازدان‌و ناردنی مەفرەزە، کە پێویست بوو لەسەرەتادا بە پاڵپشتی هەڤاڵاتی ڕێکخستن زانیاری تێروتەسەل لەسەر جێگاو شوێنی کارکردن‌و بڕی کاتژمێری ئیش کردن‌و مانەوەو ڕێگای ڕۆیشتن‌و هاتنەوەیان لەسەر کۆبکرێتەوە. دوای ئەوەش بە ئەندازەی گەورەیی یان بچووکی چالاکی‌یەکە مەفرەزەیەك یان دوو مەفرەزە لە ناوچەیەك دا کۆ ئەبوونەوەو لە ماوەیەکی دەست نیشان کراودا پرۆسەکەیان بە ڕۆژی ڕوناك یان بەشەوی تاریك جێبەجێ ئەکرد. لەوانەش هەندێکیان لەسەر ئیش‌و کارو هەندێکیان لەسەر ڕێگاویانەکانی هاتوچۆکردن‌و هەندێکی تریان لەسەر ڕۆخی ئاوێك کە سەرقاڵ بوون بەڕاوکردنی ماسی‌یەوە دەستگیرکران کەبریتی‌بوون لە کارکەری (ڕوسی، ئەڵمانی، پۆڵۆنی، یۆغسلاڤی)و ڕەگەزی تر.

ئەوەی وەڵامی پێویست بوو لەم بارەیەوە بدرێتەوە، سەرلنی بەعس لە کاردانەوەیەك دا بۆ ئەوەی بیانی‌یەکان بە زیندوێتی یان بە کوژراوی بهێنێتەوە، بێجگە لە ناردنی کۆیتەرو سوپاو لەشکرکێشی چوارقۆڵی بۆ سەر ناوچەکە، نە ئامادەبوونی خۆیان بۆ دانووستان‌و گفتوگۆی سیاسی دەربڕی، نە لەمەودواش بۆ ڕاوەدونانی پێشمەرگە هێرشی پیادەیان ڕێك ئەخست، بەڵکوو لە زنجیرەیەك چالاکی تردا چاوو گوێیان لێ خەواندو لەبایەخی پرۆسەکەیان کەم کردەوە.

هەرچەندە چالاکی‌یەکەش بەدەر نەبووە لە زیان‌و سەرئێشە بۆ هەڤاڵاتی دەرەوە، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات‌و بەسەرچوونی ماوەی چەند مانگێك لە دەستگیرکردنی بیانی‌یەکان دا، بەڕێزەوە ئازاد ئەکران‌و لە گەڕانەوەیان دا بۆ وڵاتەکانیان، لەوێ باسیان لە کردەوەو ڕەفتاری زۆر جوامێرانەی پێشمەرگەو لێپرسراوەکانیان دەکرد کە چۆن ئەوان لە ڕووی جێگاو شوێنی حەواندنەوەو جۆری خواردن‌و شێوەی مامەڵەکردنەوە هیچ جیاوازی‌یەکیان لەگەڵ ژیانی یەکێکی پارتیزان دا نەبووە. بەمجۆرە ئەوەی چالاکی‌یەکەی لە دەرەوەی وڵات سەنگین ترو پڕ لەماناتر ئەکرد ئەم دەسکەوتانە بوون:-

- ئەزموونی جوڵانەوەیەکی نوێ لە کوردستان دا ئەسەلمێنێ‌و ئەیدات بە گوێی جیهان دا کە گەلێکی وا بەدەگمەن ماوە بۆ مافەکانی تێبکۆشێ‌و ناچار بێت ڕێگای شۆڕش‌و ڕاپەڕین بگرێتەبەر.
- پرسی کوردان سنوری ناوچەیی‌ئەبەزێنێ‌و لەسەر زمانی ئەوروپی‌یەکان دا گەواهی بۆ ستەمی نەتەولیەتی کورد لە عێراق دا بدەن.
- کورد بە ئازادیخوازو پەروەشی ڕزگاری‌و پێشکەوتنخوازیی بناسرێتەوە، نەك بە مافیای تیرۆرو تۆقاندن‌و خەڵك ڕفاندن‌و حەزنەکردن لە چارەی بێگانەو ڕەت کردنەوەی ئاینی مەسیح‌و کاسۆلیك‌و پرۆتستانت‌و هی دیکە ئاوزەد بکرێ.

- هەژموونی زاڵی پێشمەرگەو سەرکردایەتی‌یەکەیان دەرئەخست. هەم لە باڵادەستی هێزەکانی پێشمەرگە بەسەر ناوچەو ڕوبەرێکی فراوان دا لە هەرێمی کوردستان، هەمیش لە ئاراستەکردنی سیاسەت داو جێبەجێکردنی تاکتیکی عەسکەری‌و دانانی نەخشەو شێوازو جۆری مامەڵەکردن لەگەڵ بێگانەو دەوروبەردا.

- بە مل کەچ کردنی‌و وڵاتانی پەیوەندی دار بە تەنگژەکەوە، لە سۆزلخی گرتن‌و بانگهێشتی لایەنی بەرپرس لە ئەنجام دانی‌و ئامادەبوونیان بۆ لێکۆڵینەوەو دانانی ڕێ‌و شوێنی گونجاو، کە بەئازادکردنی دەسگیرکراوەکان کۆتایی پێ بێت.

- تۆبەرەی هاوکاری، لەسەر بنەمای ڕێزگرتن‌و دڵکۆکی‌کردن لە ڕەوایی کێشەی نەتەوایەتی کوردیان لێ ئەکەوتەوە، دواتریش کارئاسانی‌یان بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش‌و کاری هەڤاڵان لە دەرەوەو ناوەوە دەستەبەر ئەکرد.

- پرۆسەکە ئەبوو بە مانشێتی گرنگترین هەواڵی ڕۆژنامەکانی ئەو وڵاتەو لە وردەکاری دەسگیرکردن‌و مانەوەو سەربوردەی ژیان‌و هەڵسوکەوتی بەرامبەرو دەرفەتی ڕزگاربوون‌و هەروەها لەسەر کوردستان‌و شۆڕشەکەی، ڕاپۆرتی گشتی‌یان لەو ڕووانەوە بڵاوئەکردەوە.

- چەردەیەك پارە بەناوی کۆمەکی دارایی‌و دەستی یارمەتی درێژکردن ئەدرێ بە نوێنەرەکانی (ی.ن.ك)و لەوێشەوە ڕەوانەی کوردستان ئەکرێتەوە، تابتوانێ کەلەبەرێ لەو بۆشاییە پڕ بکاتەوە کە خەرجی ڕۆژانەی زۆر لە پێداویستی‌یەکانی شۆڕش بوون.

- ئەو وڵاتە ئەبوو بە ناوەندێکی سەرەکی بۆ هاتوچۆو داڵدەدانی پێشمەرگەو ئەندامەکانی یەکێتی کە تیایدا بنکەو بارەگایان لێ دروست بکرێ بە پاڵپشت‌و پشتیوانی دەوڵەتی خانەخوێ.

- بە پێشکەش کردنی داوودەرمان‌و کەلوپەلی فریاگوزاری پزیشکی‌و ئامێری نەشتەرگەری سەرەتایی‌و وەرگرتنی بریندارەکانی شەڕو بواردان بە درێژکردنەوەی ماوەو مۆڵەتی چارەسەرکردن لە نەخۆشخانەکانی وڵاتەکانیان دا.

- ڕێدان بە دەرکردنی ڕۆژنامەو بڵاوکردنەوەی کتێب‌و چاپ کردنی پۆستەرو نامیلکەو گۆڤارو نووسینی جۆراوجۆرو سازدانی کۆڕو ئاهەنگی بۆنەو یادکردنەوەکان‌و پەخش کردنی بەیاننامە لەسەر ڕوداوەکانی کوردستان‌و دەوروبەر‌ولاسی‌و جیهانی ئەو ڕۆژە.

– زۆر لە ناوەندەکانی تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەگەری و ڕۆژهەڵات ناس و مێژوونووس و ڕۆژئاوایی و توێژەرەوە سەردانی یەك لە دوای یەکی کوردستان بکەن و لێکۆڵینەوەی جیاجیا لەسەر کوردو جوڵانەوە نوێیەکەی تۆمار بکەن و بە جیهان دا بڵاویان بکەنەوە.

– پێگەی سیاسی شۆڕشەکەی، بە شێوەیەکی ڕێکخراوەیی، بە دیسپلین، خاوەن کێشەو بەرنامە لە دەرەوەی نیشتمان بەرجەستە ئەکرد.

## ٤/ وریاکردنەوەی خۆفرۆشانی نەتەوە.

پەرەسەندنی دیاردەی بوون بە (جاش، جەیشی ئاشەعبی، سیخوڕی، چەکداری حزبی)، پاڵی بە چەندین کەسانی ترەوە ئەنا بۆ سنوری بەزاندنی شەرم و چاولێکەری ئەم یا ئەو، یان بەهۆی گوشاری بەعسەوە بین بە لایەن و بەشداری سەرەکی و ناسەرەکی لەو تاوانانەی حکومەتی عێراق دا بکەن کە دەرهەق بە خەڵکی کوردستان دەیگرتە بەرو لە هەڵوەشاندنەوەی ڕیزەکانی گەل و مراندنی هەستی نیشتمان پەروەری دا ڕۆڵێکی ناوخۆیی بگێڕن. ڕۆڵێك کە لە لاوازی کەسێتی و ڕاڕایی لەبیرو ویژدان و هەست نەکردن بە لێپرسراوێتی مێژووییەوە سەرچاوەیان گرتبوو، خەریك بوو لەپاڵ پشتگیری یە ڕاستەوخۆیەکانی ڕژێم دا بە دەیان تۆخم پاساوی بێ بنچینەی لادەر لەگەڵ خۆیان دا لوول بدەن و کوردەواری لەسەر ڕاستەڕێی گیانی بوون و مانەوەی، نوقمی زەلکاوی خۆفرۆشی بکەن و گومان و دڵەڕاوکێ درز بخاتە نێو وتاری نەتەوەوە. ئەو هۆیانەش بریتی بوون لە:–

– پشتگیری ڕاستەوخۆی دلەو دەزگا ئەمنی و سەربازییەکانی ڕژێمی سەرکار لە دەست چێنی کەرلکانی خۆفرۆشی دا.

– لەخۆ گرتنی دەیان کەسێتی خاوەن کێشەو ڕابوردوانی بکوژ لە ڕێگای کردنەوەی دەرگاکانی (مفرزە خاصە)وە.

– مفرزە خاصە، ئەبووە پەناگەیەك بۆ داڵدەدانی چەندین تاوانبارو ڕەوشتی لادەرانە لەناو کۆمەڵدا.

– بەزۆرەملێی سەپاندنی چەك و دابەش کردنیان لەلایەن میرییەوە بەسەر ناوچەکانی نزیك شارەکان و دەوروبەریان دا.

– بەپێی ئارەزومەندانەی گوندنشینەکان بۆ پارێزگاری کردن‌و مانەوە لەسەر ئــاوو زەوی‌و زارەکانیان.

– لە هەڵرشتنی پارەی زۆرو دەسکەوتی پارچە زەوی‌و خانووی نیشـتەجێ کـردن‌و بەشـی تایبەتی لە دەست بەسەرلگرتنی کەلوپەلی نەیارەکانی دەوڵەت دا.

– بەهۆی ڕکابەری‌و ململانێی نێوان دوو بنەماڵە، لە پاشان چەکدارکردنی لایەکیان لە دژی لایەکەی‌تر، یان هەردووکیان پێکەوە.

– لە خستنەڕووی دەروازەیەك بۆ خۆ دەوڵەمــەندکردن‌و بـەتاڵان بـردن‌و بازرگـانی‌کردن بـە چارەنووس‌و ژیان‌و سەرماڵی کوردەوە.

– بـەهۆی زۆرلـی ڕەوشـت‌و کاڵبوونـەوەی ڕێـزو ناویـانگ‌و کەسـێتی دیــاری‌کراو لــە ڕێــك متمانەکانی پێشووی‌دا.

– بە درێژەکێشانی جیۆپۆلەتیکی کوردسـتان‌و ڕەشـبینی نەتەوایـەتی لـە دروسـت بـوون‌و دامەزراندنی حکومەتی خۆماڵی‌و سەربەخۆدا.

– بەهۆی شێواتی کولتوری کــوردەواری لـە پرۆسـەی توانـەوەو بەجێهێشـتنی شـوێنەواری تێکەڵ بوون لەناو کولتوری نامۆو سەرئێشەی دانیشتوانی عەرەب دا.

– لەدەست دانی بیرو وشیاری لە ژێــر پاڵەپەسـتۆی دەرونـی‌و قەیرانـە کتوپـڕە چـارەڕوان نەکراوەکانی دەورویەردا.

– بەهۆی سزادانی (پ م)ی نادەروەست‌و بەکارهێنانی چەك‌و ناوەکـەی بـۆ بەرژەوەندیـیـە تایبەتی‌یەکانی خۆی، لەبری ئامانج‌و بەرژەوەندی‌یە باڵاکانی (ی.ن.ك).

– لەوەرچـەرخانی هەڵوێسـت‌و مـاندووبوون لــە کاروانــە درێژخایەنەکـەی شـۆڕش دا بــە گولستنەوەی سەنگەر بۆ ناو ڕیزەکانی دوژمنەکانی دوێنێ.

– لەپێ داگرتنی (منظمة)و لقەکانی بەعس لەسەر ناچارکردنی (مۆیدو نصیرو رفاق)ەکــان بۆ هەلگرتن‌و لەشان کردنی چەك.

– بە هەڕەشەی نان بڕین‌و لابردن‌و پلەداگرتن‌و بێبەش کردن لە ئیمتیــازو پۆسـتی ئیـدارە لە هەموو فەرمانبەرو بەڕێوەبەری فەرمانگەیەك.

- جەخت کردنی خوێندنگاکان لەسەر دەرنەچواندنی خوێندکارو بەدەست نەهێنانی نمرەو باوەڕنامەی بەرز لە قۆناغەکانی خوێندن دا.
- لە فریوو خواردنی خەڵکێکی قایل نەبوو بە سەربازی کردن لە ڕیزەکانی سوپادا بۆ ئەوەی ببن بە جاش، یان لە سنووری ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگەدا، سیخوڕی بۆ داگیرکەر بکەن.
- نەبوونی ناوەندێکی لێپێچینەوە.

بۆیە لەم قۆناغەدا چیتر نەدەکرا، شۆڕشەکە لە ڕاست ئەو هەموو دیاردە خۆفرۆشی‌و دزێوانەدا بێ هیچ وەڵامێکی پەرچەکردار دۆش دامێنێ‌و لە بێ دەنگی‌دا چاوو گوێیان لێ بخەوێنێ، بەڵکوو لە بەرەنگاربوونەوەیەك دا بۆ چارەسەرکردن‌و کەم کردنەوەو ئەندازەی پەکخستنی دیاردەکان، پرۆسەیەکی هاوپەیمانی پێشمەرگەیی‌و ڕێکخراوەیی‌یان لێ ئەکەوێتەوە.

پرۆسەکەش بە جیاجیاو بە دوو شێواز بەڕێوە ئەچێ. یەکێکیان بە هەماهەنگی ڕێکخستنی شارو بەرەو شارەکان‌و لە مەفرەزەیەکی دابەش کراودا بۆ دەستەی وریاکردنەوەو دانانی دەستەیەکی تریان بۆ هێڵی پاشەکشێ پێك دێ. ئەوی تریان بە پشتیوانی‌و ڕێ پیشاندەری گوندنشینەکانی دەوروپشت‌و بە هاوکاری‌کردنی ڕێکخستنی ناو دێ‌و بەرەو ئاواییەکانی لەخۆ گرتنی جاش‌و بە هەمان مەفرەزەو ژمارەی پێشمەرگەو دابەش بوونەوە ئەنجام ئەدرێ. ئەو شێوازو جۆری مامەڵانەش بریتی‌بوون لە (ڕێنمایی پێشوەخت‌و ئامۆژگاری کردن‌و بواردان). لەسەرێکەوە بە ڕێگای (قسەکردن‌و ئاخاوتن لەگەڵ خێزان‌و دەرو دراوسێ‌و کەس‌وکارو خزم‌و ناسیاوەکانی چەك لەشان کردووەکەدا بۆ دەست بەردار بوون لە لایەنگری‌و کلکایەتی کردنی بۆ ڕژێم). یان بە(ڕێکخستن‌و ڕەوانەکردنی شاندی ڕیش سپی‌و پیاوانی دەستڕۆیشتوو لە ئاواییەکانی دەوروبەرەوە، بۆ گەیاندنی مەرج‌و داواکاری‌یەکانی شۆڕش لەسەر فڕێدانی چەکەکانیان‌و خۆ پاك کردنەوە بە ئاشتی‌و بە خۆشی). دەنا لە سەرێکی ترەوە، بە پێچەوانەی ماوەی مۆڵەتە بڕیار لەسەر دراوەکان، دەستی(سزادان‌و ڕیشەکێش کردنی نیشتمان فرۆشی‌و دەسگیر کردنی لادەرەکان) ئەچووە بواری جی‌بەجێ‌کردنەوە.

لە دەرهاویشتەکانی پرۆسەکەش دا، ڕای گشتی کۆمەڵگا لەسەر چەندین گوشاری پەیوەندی پچڕاندن و لە یەك جیابوونەوەو هاشا لێ کردن گەلاَڵە ئەبێ و باوان لە کوڕو ژنان لە مێردو کەس و کارو لە پوورزاو ئامۆزا، بە ئاراستەی دژو پێچەوانە کردنەوەی دیاردەکان ڕۆیشتن و زیانەکانیان گۆڕییەوە بە قازانج. تەنانەت زۆرێك لەوانەش بۆ گەردن ئازایی و ئەستۆ پاکی هاتنە دەرەوەو داوایان کرد ببن بە پێشمەرگە. لەو لاشەوە (منظمة)ەکانی بەعس لە پای ئەو ژمارە تفەنگەی بەرەو شاخ ئەڕفێنرێن، کەمتر لە جاران خوێندکاران و خەڵکەکەیان بۆ هەڵگرتنی چەك ناچار ئەکردن. هەروەها ترسیش بخاتە ناو دڵی کاربەدەستەکانی ترەوە بۆ ئەوەی چەکەکانیان لە گوندنشینەکان وەربگرنەوەو لە ڕوداوەکانی تردا هەڵوێستی خراپتر لەوانەش ڕوبەڕویان نەبێتەوە. بە هەر حاڵ پرۆسەکە دیاردەی بوون بە جاش و ئەڵقە لە گوێی لە کوردستان بنەبڕ نەکرد.

## ٥/ هەڵمەتی لە ناکاو بە تفەنگ و نارنجۆکی دەستی و دەمانچە.

ئەم چالاکییە شەڕی گواستنەوەی سەنگەر بوو لە شاخ و سەرجادە گشتییەکانەوە بەرەو ناوەوەو لەسەر دام و دەزگاو بنکەو بارەگاکان و نێومال و شوێنی وەستان و چەقی مۆڵگاکانی دوژمن لە شارەکان دا، بە مەبەستی فراوانتر کردنی مەوداکانی شەڕو وەشاندنی گورزی پێشمەرگانە لە (ئەمن و پیاوانی سیخوڕو جاش و جەللادو پۆلیس و تاوانبارانی بکوژو تەواری و لێپرسراوەکانی (منظمة)و ڕێکخراوەکانی بەعس و ئاسایش و پۆلیس خانەو دۆست و هاوکارو خەڵکە باوەڕپێکراوەکانی ڕژێم). کە هاوزەمان بوو لەگەڵ ئەوپەڕی تاوانەکانی حکومەتی عێراق، لە (جەوری نەتەوایەتی و زەبروزەنگی مامەڵەکردن و ڕاونانی کەس وکاری پێشمەرگەو نیشتمان پەروەرو تێکۆشەران و ئەنجامدانی ڕەشبگیری و تۆقاندن و لە گرتووخانەو زیندانی کردن و گوللەبارانی سەرجادەو لە سێدارەدانی بەکۆمەڵ و لە پاشان دەسگیرکردنی ڕوناکبیرو هونەرمەندو ڕاپێچ کردنی هەموو خاوەن بیروڕایەکی سەربەست.

لەسەر داوای مەفرەزەکە یان پێشمەرگە خۆیان، پێویست بو لە کاتی جێبەجێکردنی هەر چالاکییەك داو بەپێی قەبارەو گەورەیی ئەنجام دانی پرۆسەکە، دوو تاسێ پێشمەرگەی پارتیزان دەست نیشان بکرێ و دواتریش لەوردەکاری و جۆری ڕاپەڕاندنیان دا

مەرجی شارەزایی‌و ڕەچاوکردنی ڕۆیشتن‌و هاتنەوەو سەردەرکردن لە ڕێگاویانەکان‌و دزەکردن بۆ قولایی‌و نزیك بوونەوە لە ڕەبایەو پێگەکانی دوژمن‌و دۆزینەوەی حەشارگەو شوێنی دالدەبردن تا ئەو کاتەی دەرفەتی پاشەکشێ بۆ ڕزگاربوون‌و بەجێهێشتنی شار ئەڕەخسێ، ئەبونە خالێکی سەرەکی‌و پێش کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر نیشانەکان‌و تەقەکردن ئەکەوتن، ئەوساکەش قسە لە دانانی نەخشەو بەکارهێنانی وێنەو هۆیەکانی ڕوون کردنەوەو ئاراستەکردنی چۆنیەتی پەلاماردانەکە ئەکراو لە مەودای تێبینی‌و لێکدانەوەکان دا شوێن‌و جێگا بۆ ئەگەرو گریمانەکان ئەکرایەوەو لە ئاووهەوای ئەڕوتوشی‌دا پێویست بوو پارتیزانەکان لە ڕێگای ئۆتۆمبیل‌و سواری مەکینەوە دەرباز بکرێن. ئەو هەلمەتانەش خۆیان لە (تۆلەکردنەوەو چاوشکاندن‌و پەنددادان)دا دەبینی‌یەوە. نیشانەکانیان بریتی‌بوون لە (چەقی بازگەکان‌و بۆسەی سەرجادەکانی شەوو لەدژی دەزگاکانی سەرکوت کردن‌و ئیستیخبارات‌و ئەمنی جۆراوجۆرو وێستگەکانی کۆبوونەوەی تەواری‌و جەیشی شەعبی‌و چەکدارەکانی پۆلیس)، هەروەها ئاگریەردان لە زیل‌و ئیڤاو تەنکەرو هەلگری سەربازو پەلاماردانی قوات خاصەو مغاویرو ئۆتۆمبیلی جاشەکان، بە تفەنگ‌و نارنجۆکی دەستی‌و دەمانچەو بەرەنگاربوونەوەکانی دیکە.

ئەوەی پەلاماردانەکانی پڕ لە بایەخ ئەکرد، ئەو هەماهەنگی‌یانەی ڕۆح بوو کە تێکەلاو بە دەروون و ویژدانی خەلکی شارەکان ببوو لە پێشکەش کردنی پشتیوانی لەخۆگرتن‌و شاردنەوەودەربازکردن‌و چاوساغی‌کردنی مەفرەزەکانی پێشمەرگە، لەکاتێك دا هیچ باکیان نەبێ لە سزادانی ڕژێم‌و لە دەرئەنجامەکانی کوشتن‌و مال وێران بوون‌و ڕاپێچ کردنی ژن‌و منال‌و ئەو شوێنەوارانەی تر کە لێیان ئەکەوێتەوە. هەروەها ئەوەندەش بالادەستی پێشمەرگەو تواناکانی شەڕکردنیان لە چالاکی‌یەکان دا بسەلمێنێ‌و بە ئەندازەی کەمترین زیان‌و بە زۆرترین قازانج‌و دەسکەوتی جیاجیای چەك‌و پێداویستی‌یەکانی ترەوە لێیان بگەڕێتەوە. بەلام دەسەلاتداران لەسەرویەندی ئەنجام دان‌و بەڕێوەچوونی هەر پەلاماردانێکی پێشمەرگەیی‌دا چەندین پلان‌و ڕێ‌و شوێنی سوپایی‌و پۆلیسی یان پیادە ئەکرد، کە گرنترینیان ئەمانە بوون:—

– دەسبەجێ چوار دەوری شوێنەکە بە تەواری‌و قوات خاصە ئابلۆوقە ئەدرێ.

– ژمارەیەکی زۆر لە لاوان‌و خەلکی بێ ئاگا لە نزیك ڕوداوەکەدا دەسگیر دەکرێن.

- به بڵندگۆ جاڕی قەدەغەکردنی هاتوچۆیان دەرئەکرد.
- سەرکۆڵان و شۆستە و باڵەخانە و نێو بازاڕەکانی بەهێزی سەربازی پڕ ئەکرد.
- هەڵمەتی ماڵ بە ماڵ و لێپێچینەوە و سۆراخ و ڕەشبگیری هاووڵاتیان دەستی پێدەکرد.
- لەسەر هەر جادەیەك مەفرەزەیەکی تێکەڵاو لە پۆلیس و ئاسایش دەستیان بە پشکنین ئەکرد.
- ئەرکی بازگەکان خەریك کردنی ئەو ئۆتۆمبیلانە ئەبوو کە ئەیانویست بۆ دەرەوەی شار بڕۆن.
- (دەورییە)ی ئاسایی بە شێوەی شەوانەڕۆژ زیاترو چڕوپڕتر ئەکرێتەوە.
- هەموو ڕێگایەکی ئۆتۆمبیل و پیادە لە پێش و پاش و تەنیشت هەر دام و دەزگایەکی حزبی و ئیستیخباراتی‌دا کۆم ئەدرێن.
- هەر ئاپۆرە بەستنێکی هاووڵاتیان لە ژێر گوشاری تفەنگ و چاوسورکردنەوەدا بڵاوەیان پێ ئەکرێ.
- گشت وەستانێکی ئۆتۆمبیلی سەربازی لە نێو بازاڕو سەنتەری شارەکان دا قەدەغەئەکرێ.
- بە شەو سەردانی کەس‌وکارو ماڵی یەکتری، بە توندی لێپێچینەوەیان لێ ئەکرێ.
- تەقەکردن و ڕاونان و بە ئەنقەست تاڵ کردنی ڕەوشی شارەکان، لەگەڵ ئاوابوونی خۆردا.
- هێزەکانی ئەمن و تەواری ئەوپەڕی دەسەڵاتیان بۆ هەر بەرەنگاربوونەوەیەك پێ ئەدرێ.
- بۆسەی جۆراوجۆریان لە دەوروبەری شارەکان دا دەرئەکرد.

### ٦/ لێدانی بۆسەنانەوەی جاش و عەسکەری.

زەمینەکەی. ⟵ ڕێگری لە پەلاماردانەکانی پێشمەرگە.

شوێنی چالاکی‌یەکە. ⟵ لە دەوروبەری شارو شارۆچکەکان. نزیك لە کارگە، پرۆژەی کەویزار، هۆڵی ئاژەڵداری.

کۆکردنەوەی زانیاری. ⟵ لەسەر جوگرافیا ⟵ژمارەی هێز ⟵جۆری چەکەکان.

ژمارەی پێشمەرگە. ← لە مەفرەزەیەکی (٨-١٢) کەس.

چەکی کاریگەر. ← ئاربیجی ←ڕەشاش ژ/٢و هەندێ جار بە ← بی کەی سی.

ڕێ پیشاندەر. ← مەڤالانی ڕێکخستن ←خەڵکی ناوچەکە.

سەروەختی پەلاماردان. ← لەگەڵ تاریك بوون ←لە قوڵایی شەودا

ماوەی ڕوبەڕوبوونەوە. ← نیو کاتژمێر ←کەمتر لە سێ چارەگ.

دەست نیشان کردنی پاشەکشێ. ← بۆ ئاوایییەکی دوورە دەست، یان ←سەرچاوەی ئاو، یان ←دۆڵێك.

بەرپەرچ دانەوەی سوپایی. ← تۆپ باران کردنی پێشمەرگە ←گوندنشینەکان ← لەشکرکێشی سەربازیی.

هەڵوێستی دەزگاکانی سەرکوت کردن. ← ڕەشبگیری← گرتنی کەس و کاری پێشمەرگە، یان ←دەرکردن.

جێهێشتنی کاردانەوەی دەرونی. ← رق ئەستوربوونی جەماوەر لە ڕژێم.

* * *

## ٧/ ڕفاندنی چەك، تایپ و ڕۆنیۆ، داوودەرمان.

هۆی چالاکییەکە. ← بوونی بۆشایییەك بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی شۆڕش.

شوێنی ئەنجام دانی. ← لە دەست، یان لە ←ماڵی خۆفرۆش ←دام و دەزگاکانی دەوڵەت ←بنکەکانی تەندروستی.

دزەکردن بۆ ناوشار. ← بە ڕوناکی ڕۆژ ←لە کەشی باران بارین و تەم ←بە تاریکی شەو.

هۆی گواستنەوە. ← بە پیادە ←بە سواری ئۆتۆمبیل ←لەگەڵ ڕانەمەڕو کایەل.

بەشداری پێشمەرگە. ← (٢) تا (٣) پارتیزان.

چەکی بەکارهێنراو. ← تفەنگی یەك لاق ←ویزە ←دەمانچە← نارنجۆکی دەستی.

مەرجی داواکراو. ← بوونی شارەزایی پێویست ←بەپەلە ئەنجام دانی پرۆسەکە.

هەلومەرجی لەبار. ← ڕۆژانی پشوو ←پاش دەوام.

پشتگیری لایەن. ← ڕێکخستنی شار ←کارمەندی فەرمانگە←شۆفێری گواستنەوەی دەرەوە.

ماوەی جێبەجێکردن.← کەمتر لە نیوکاتژمێر.

گەیاندنی دەسکەوت. ← بە شان ←کوڵەپشت ←بە تراکتۆر.

ئەگەرو گریمان. ← پرۆسەکە دواخرێ، یان بۆ ←ڕۆژی دواتر.

هەڵوێستی فەرمانگە. ← پێکهێنانی لیژنەی لێکوڵینەوە بەهاوبەشی ئەمن ←گرتنو لە سێدارەدان ← بێسەرو شوێن کردن.

* * *

## ٨/ شەڕی خاڵە لاوازەکانی دوژمن.

مەبەست. ← ئەو چالاکییانەن کە دوژمن تیایان دا پەرشو بڵاون، یان ←بەرگرییان کەمە ←یان هەرنییە.

ئامانجەکان. ← تۆڵەکردنەوە ←پەنددادان ←بەدەست هێنانی چەكو تەقەمەنی.

جۆری چالاکییەکان. ← لەسەر دیدەوانی ڕۆژ ←چوونە ناو گوند ←لەسەر کانیو چەم ←کاتی گۆڕینی ڕەبایە.

هێزیپەرتەوازەی دوژمن. ← لە (١-٢) سەرباز ←جەیشی شەعبی ←جاش.

بەپێی کات. ← بەڕۆژی ڕوناك ←پێش ئاوابوونی خۆر.

دەرفەتی گونجاو. ← خەریك بوون ←گوێنەدان بەدەوروبەر ←خەیاڵ بردنەوە.

بە بازووی. ← (١) تا (٢) پێشمەرگە.

هێرش بە هۆکاری. ← تفەنگ ←دەمانچە ←نارنجۆك.

ماوەی بەڕێوەچوون. ← لەنێوان (٥) تاوەکوو (١٠) خولەك.

شێوەی ئەنجام دانیان ←بە سەرنج و تێبینی کردن ←هەڵمەتی لەناکاو ←بە دیل گرتن.

پێوەری مامەڵەکردن. ← دەسبەجێ ئازادکردنی دیل، یان ←گل دانەوەی بۆ ماوەی هەفتەیەك.

کردەوەی سەربازی بەعس. ← لەشکرکێشی سوپایی کتوپڕ ←بەریوونە گیانی خەڵك ←دەسگیرکردنی لاوەکان.

ڕێ و شوێنی بەرەنگاربوونەوە. ← بە دۆزینەوەی هۆکارەکان ←جێگرتنەوەیان بە مدرعە←بە قەدەغەکردنی بڵاوە.

* * *

## ٩/ دەسگیرکردنی پیاوانی سیخوڕو تاوانبارانی گەل.

لەڕێی. ← نانەوەی بۆسە ←دەست نیشان کردن← پشکنین و دەسکەوتنی ناسنامە.

سەکۆی چالاکییەکە. ← لەسەر جادە گشتییەکان ←شوێن و جێگای نیشتەجێبوون ← لەسەیرانگاو هاوینەهەوارەکان دا.

ڕەگەزی جوگرافیا. ← پێویستی شارەزایی تێروتەسەل ←کەڵک وەرگرتن لە بەرزایی و نشێو ←کەشی جیاواز.

گەیشتن بە نیشانە. ← بە هۆی پیادەوە ←وەرگرتنی ماوە ←تێکەڵ نەبوون← دڵبەش بوون.

بەپێی. ← زانیارییەکانی ڕێکخستن ←پشت بەستوو بە بەڵگەنامەکان ←وتەو گەواهی زۆرینەی کۆمەڵانی خەڵک.

هەلی لەبار. ← پێش و پاش نیوەڕۆ ←بە تاریکی شەو.

لەسەر دەستی. ← ئەندامانی مەفرەزەیەك، یان ←کەمتر لەو ژمارەیە.

چەکی داواکراو. ←. قورس ←ناوەنجی ←سووك.

ئەندازەی بەڕێوەچوونی. ← لە نێوان نیوو، تاوەکوو ←یەك کاتژمێر.

ڕێ و ڕەسمی پاشەکشێ. ← بەخێرایی چۆڵکردنی ناوچەی چالاکییەکە←دورکەوتنەوە لە ئاسۆ ←لە سواری ئۆتۆمبیل و هۆیەکانی تر.

دەسکەوت. ← دەمانچە ←تفەنگ ←بەڵگەنامە←مۆری جۆراوجۆر.

لێکۆڵینەوەو سزادان. ← بە گوێرەی تاوانەکانی دەسگیرکراو ←زیندانی کردن← گەیاندنی بەسزای گەل و شۆڕش.

هێرشی بەرامبەر. ← بە تۆپ باران کردن ←ناردنی کۆپتەری بارهەڵگرو جەنگی← لەشکرکێشی چوارقۆڵی.

زەبروزەنگی ناوشار. ← قەدەغەکردنی هاتووچۆ←پشکنینی ماڵان ←ڕاپێچ کردنی ژمارەیەك لە کۆمەڵانی خەڵک.

* * *

## ١٠/ دەست وەشاندن لە پرۆژەکانی ئابوری دەوڵەت.

بیرۆکەی چالاکی‌یەکە. ← بەمەبەستی گەیاندنی ئەوپەڕی زیان‌و ←پەکخستنی تەقەلاکانی میری.

لە پرۆسەی. ← دەرهێنان ←بەرهەم هێنان ←بەتالان بردن.

پرۆژەکان. ← لەکەرەستەی خاو، بیناسازی ←دروست کردنی تۆڕی ڕێگاوبان← کێڵگەی ئاژەڵداری‌و پەلەوەر.

هەڵگری ناسنامە. ← کەرتەکانی حکومەت ←لایەنگرانی بەعس ←خۆفرۆشانی نەتەوە.

شوێنەکانیان. ← لە چەقی شارەکان ←بەتەنیشت شارو شارۆچکەکان ←لە نزیك ڕەبایەکان.

پێویستی زانیاری. ← لە هەڤالان ←خەڵکی ناوچەکە←کەسانی هەڵسوڕێنەر.

گونجاوترین کات. ← دەمەو ئێوارە ←لە تاریکی شەودا.

ژمارەی (پ.م). ← مەفرەزەیەك، یان بە ←شەش پارتیزان.

چەکی پەلاماردان. ← بە BKC ← RBG ← کلاشینکۆف.

ماوەی جێبەجێ کردنی. ← یەك، تا ←نیو کاتژمێر.

جۆرەکانی دەست وەشاندن. ← بەگوللەی ئارپیجی ←سوتاندن ←لەکارخستن.

دەسکەوت. ← کەلوپەلی جۆراوجۆر ←ڕانەمەڕ.

ڕێگریی سەربازیی. ← زۆرترکردنی ڕەبایەکانی دەوروپشت شارەکان ←بۆسەنانەوەی عەسکەری‌و جاش لە نزیك پرۆژەکان.

* * *

هەر کە چالاکی‌یەك بەڕێوەئەچوو، فەرماندەی مەفرەزەو ڕابەرسیاسی مەفرەزەکە پێشمەرگەکانیان کۆئەکردەوەو لەبارەی پرۆسەکەوە بیروڕایان ئالوگۆڕ ئەکردو دەستخۆشی‌یان لە ڕۆڵی ئازایانەی ئەو ژمارە پێشمەرگەیە ئەکرد کە تیایدا دەرئەکەوتن‌و بەڵگەی هەرەدیاریان لەو ڕووە بەنموونە ئەهێنایەوەو قسەیان لەسەر شێوازی هەڵمەت‌و ناچارکردنی دوژمن‌و خاڵە بەهێزو لاوازەکان‌و شوێنەکانیان ئەکرد کە چۆن ئەوان لە ناو گەرمەی پەلاماردان‌و شەڕو کوشتاردا ڕوبەڕوی هێزەکانیان بوونەتەوەو دەستی باشیان لێ وەشاندون، ئاهواش لە چەند لایەکی ترەوە شەڕی پاڵپشت‌و بەرگری‌یان لە هەڤاڵەکانیان کردووەو گوشاری تەقەکردنیان لەسەر کەم کردونەتەوەو شان بەشانی ئەوانیش بەکردەوە جەنگاون.

شۆڕش‌و تێکۆشان‌و بەرگری، بە هەزاران ڕۆڵەی لەناو کۆڕی خەبات دا کرد بە کادری عەسکەری‌و بەسەدان لەو تێکۆشەرانەش گیانی خۆیان لە پێناو پیرۆزی‌و ڕەوایی مافەچارەنووس سازەکان دا بەخشی‌و بەسەدانی تریش لەوانە پلەوپایەی گرنگی لێپرسراوێتی‌و سەرکردایەتی‌یان وەرگرت بەبێ ئەوەی لە هیچ قوتابخانەیەکی عەسکەری‌دا زانستەکانی جەنگ‌و ڕاهێنان‌و خۆسازدان‌و شێوەی جۆراوجۆری پەلاماردانەکان بخوێنن، یان زۆرێك لەوانە تەنانەت خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی تەواو بکەن. بەڵکوو لە خەبات دا فەرماندەیەکی عەسکەری زادەی ئەزموون‌و تاقی‌کردنەوەیەکی پڕاوپڕ بووە لەگیان بازی‌ی شەڕکردن‌و قاڵبوونەوەی تواناکانی ئەو بووە بەدرێژایی ئەو چالاکی‌یانەو ئەو نەبەردی‌یانەی پێشمەرگە کە تیایان دا فێری وانەکان‌و پەندەکانی شەڕکردن بێت‌و متمانە بەخۆی‌و بە هەڤالانی سەنگەرو بە لێپرسراوەکانی ببەخشێ. ئەو خەسڵەتانەش کە پێویست بوو بۆ هەڵبژاردنی پێشمەرگەیەك بە (جێگری فەرماندەی مەفرەزە) یان (فەرماندەی مەفرەزە)، ئەبوایە خاوەن ئەم مەرجانە بێت:—

— مەرجی ئازایەتی‌و سڵ نەکردنەوە.

— لەش ساغ بێت‌و تەندروستی باش‌و کەم ئەندام نەبێت.

— پێشمەرگەی ڕێبازو پەیڕەوو بەرنامەو دروشم‌و ئامانجەکانی (ی.ن.ك) بێت.

— بەرژەوەندی ڕێکخراوەکەی لەبەرچاو بگرێ‌و لە پێناویان دا تێبکۆشێ.

- کەسێکی باوەڕپێکراوی شۆڕش و خاوەن هەڵوێست و ڕابردووی ڕوون بێت.
- تەمەنی گونجاو بێت و لە ڕێك شایستەی پێشڕەوی و فەرماندەیی کردن دا بێت.
- بە کردەوە تواناکانی خەملێبێ و ئاستێکی کەم تازۆری لە وشیاری و زیرەکی و لێپرسراوێتی‌دا پێگەیشتبێ.
- لێی ڕاببینرێ کە ئەتوانێ ببێتە ڕابەری مەفرەزەیەك.
- لە مامەڵەکردن دا، گوێ بیستی بەرامبەرو سەرنج و پێشنیارو ڕەخنەی جیاواز بێت.
- سەلیقەی لە دانانی نەخشەو پلان و بەڕێوەبردن و ئیدارەدانی جەنگو چالاکی‌دا هەبێت.
- خەمخۆری هەڤاڵەکانی بێت لە شێنەیی و لە کاتەکانی شەڕو پەلاماردان و بریندارییوون و شەهید بوون دا.
- شوێن و جێگای خۆی لەناو دڵی هاوسەنگەرەکانی‌دا کردبێتەوەو پشتیوانی ئەوانی بەدەست هێنابێت.
- خۆشەویستی ڕەنجدەرانی بیروباوەڕ بێت.

هەلومەرجی ژیانی پێشمەرگەیی، ئەوپەڕی گوزەراندنی سەخت و تاقەت پڕوکێن بوو. چونکە دژوارییەکەی ئەوەندەی پەیوەندی‌یان هەبووە بە باڵادەستی و هەژموونی بەرباڵوی هێزەکانی دەوڵەت لەسەر جوگرافیای هەموو شارو ڕوبەری شارۆچکەو ڕێ و بان و دۆڵ و دەشت و ناوچەو زنجیرەیەکی شاخ و هەموو چڕبوونەوەیەکی سوپایی و ئەمنی زاڵی دوژمن لەسەر کوردستان دا، ئەوەندەش ڕەنگ دانەوەیان هەبووە لەسەر کۆنترۆڵ کردنی تواناکان و نەش و نمای وزەو تەقەلاو دەرکەوتنەکانی پێشمەرگەو بەو ئەندازەیەش توانیوویانە جموجۆڵ و چالاکی و جەولەکانی مەفرەزە سەرتاییەکان پەك بخەن و هەرچی لە ئەنجام دانی پرۆسەیەك دابن، لایەنی کەم ماوەی (٢)کاتژمێر بە پیادە ڕێ بکەن و لە گەڕانەوەش دا ڕێگایەکی دوورودرێژی (٤)کاتژمێری بگرنە بەرو ئەوساکەش پەنا بۆ کەڵۆزو قامیشەلان و بن تاشەبەردو ناو جەنگەڵ و دارستان ببەن و خۆیان لەبەرچاوی شوان و گاوان و لادێنشینەکان بزر بکەن و بە لەتەنانێکی بن باخەڵ سکی خۆیان تێر بکەن. ئەمەش لە کاتێك دا تەنگژەیەکی وا بەسەر دوو تەمەنی خوار بیست و سەروی چلەکانەوە بهێنێ کە کەمتر ئامادەبوونیان بۆ چەك لە شان کردن و پێشمەرگایەتی ئەو جۆرە ژیانە هەبێت.

هەر لە ئەنجامی ئەو دژوارییانەداو بەهۆی ناجێگیر بوونی بارودۆخێکی ئارام لە گوندو ناوچەکان دا، پێشمەرگەیەك لە کاتی مۆڵەت وەرگرتن‌و دابڕان لە مەفرەزەکەی، ڕوبەڕوی دەیان مەترسی‌و پەلاماردانی عەسکەری‌و جاش ئەبوەوە. لە کاتێك دا ئەبوو بە تاریکی شەو بچێتە ناو گوندەکەوەو سەردانی‌یەکەی بە نهێنی بپارێزێ‌و دەنگو باسی لەلای هیچ کەسێك بڵاونەکرێتەوە. ئەگەریش شاریی بوایە ئەبوو سەرەتا پرس‌وڕای بە ماڵێکی خانەخوێ بکردایەو بەو مەرجانەش کەم مناڵ‌و سەرخێزان بن‌و خانووەکەیان نەکەوتبێتە سەرەڕێگاو ڕۆیشتن‌و هاتنەوەی زۆریان بەسەرەوە نەبێت، لە پاشان پێشمەرگەکە بەدوای کەس‌و کارەکەیدا هەواڵی ئەناردو ڕۆژێك‌و دوان لەگەڵیان دا ئەمێنێتەوە. یان لە کاتی خۆشۆرین‌و چوونە ناو گەرماوەوە چەك‌و تاخمەکەی لەگەڵ خۆیا ئەبردە ژورەوەو دڵنیا نەئەبوو لەوەی کە لە ماوەی کەمتر لە نیو کاتژمێردا چی ڕوو ئەدات ئەگەر تفەنگەکەی لە ماوەڵی‌دا نەبێت. لەولەش زۆرجار ڕێکەوتووە بەدەم‌و چاوو جەستەی کەفاوی‌یەوە، پێشمەرگەکە جلەکانی لەبەر بکات‌و پەر بداتە چەکەکەی. یان لە گوێی ڕوبارەکان دا چەندین جار لە مەفرەزەکانی پێشمەرگە جاش‌و جەیشیان ڕژاوەتە سەرو ناچاربوونە بەهەمان شێوە خۆیان بۆ بەرەنگاربوونەوە لەبەر بکەن.

بە تەنیشت باروودۆخە تاڵەکانی ئەو ڕۆژگارەوەو لە دەرئەنجامی چەندین شوێنەواری (شەونخونی خەبات‌و کەم خۆراکی‌و برسێتی‌و ماندوو بوون‌و مارو دووپشك پێوەدان‌و خوێن پژان‌و برینداربوون‌و شکانی ئێسك‌و جومگەکانی لەش‌و سەرماو گەرما چەشتن‌و نەبوونی چارەسەری پێویست‌و دلوودەرمان‌و حەپ‌و گولاج‌و دەرزی) لەکاتی خۆیدا بە سەدان لە نەخۆشی‌یەکانی وەك (گرانەتاو شەوکوێری‌و ڕشانەوەو ملەخری‌و باداری‌و ریخۆڵەکوێرەو مایەسیری‌و کەم خوێنی‌و هەڵئاوسانی گەدەو زراوو جگەرو لەکارکەوتنی گورچیلەو پەنکریاس‌و بەرزبوونەوەی ئاستی شەکرەو پاڵەپەستۆی خوێن‌و نەخۆشی‌یەکانی دڵ‌و سی‌یەکان) ڕوبەڕوی هەڤاڵانی پێشمەرگە بوونەتەوەو لە بەرامبەردا زۆر لە تێکۆشەران کەم ئەندام بن‌و نەتوانن درێژە بە خەبات بدەن.

نەرێتی شۆڕشگێرانەی پێشمەرگە کە زادەی کولتورێکی پێشکەوتنخوازانەی پەیڕەوو پرۆگرام‌و دروشم‌و ئامانجەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بووە، لەگەڵ خۆیان دا

چەندین دابونەریتی ئازایەتیو رەوشت جوانیو پێشمەرگەییان بەخوێنو قوربانیدانو کردەوەو رەفتارەوە بەرهەم دەهێنا کە رەنگ دانەوەی پەروەشیو گیان بازی ئەو ئازادیخوازانە بووە بۆ شۆرشو رێبازەکەی، لە هەمیشە پاراستنو پیرۆز راگرتنی وشەی پێشمەرگایەتیو خۆشەویستی هەڤالینەو پشت بەستن بە تواناکانی یەکتریو دوورکەوتنەوە لە ململانێو گێژەنگی رکابەرییو داهێنانی نەریتی خۆ تازەکردنەوەو چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ دوژمنەکانیانو لەبەرامبەر کەسو کاری شەهیدو کۆمەلانی خەڵکو کەمایەتییە نەتەوەییو ئاینو مەزهەبو حزبەکانی تر لە کوردستان دا. ئەو دابو نەریتانەش بریتی بوون لەمانەی خوارەوە:—

## یەکەم/ لە رووی هاوسەنگەرییەوە.

— چوون بە هانای یەکترییەوەو شکاندنی گەمارەی پەلاماردانو هێرشەکانی دوژمن.
— دەسپێشخەرییو نواندنی ئەوپەری ئازایەتی لە نەبەردییەکانی پێشمەرگەدا.
— پێشبرکێی گیان بەخت کردن لە گۆرەپانەکانی شەردا.
— بەجێ نەهێشتنی بریندارو شەهید لە کاتی پاشەکشێدا.
— دەستەبەرکردنی چارەسەر لە کاتی نەخۆشیو کەم ئەندام بوون دا.
— وەکو یەکی لە پێدانی خەرجیو پارەو جلوبەرگ دا.

## دووەم/ دەرهەق بە هەڤالی شەهید.

— چوونە سەر مەزاری شەهیدو کۆرپەستن لە یادکردنەوەی چلەو ساڵرۆژی شەهید بوونیدا.
— جێبەجێ کردنی چالاکی پێشمەرگانە بە ناوی تۆڵە کردنەوەوە.
— پێشکەش کردنی پارەو پێداویستییەکانی جلوبەرگو ناوماڵ بە خێزانەکەی.
— بەسەرکردنەوەی خێزانو کەسوکارو منالەکانی شەهید.
— بە چاپ گەیاندنی پۆستەرو بلاوکراوە بۆ یادەوەرییو رێز لێنانی شەهید.
— سوێندخواردن بە گۆرو گیانی شەهیدو لەسەر سنگ دانانی وێنەکەی.

- جێبەجێ کردنی وەسیەتنامەو ئاواتەکانی شەهید.

## سێیەم/ نەریت لە بەرامبەر دوژمن.

- نەریتی شۆڕشگێڕانەی بە هیچ زانینی لەشکرکێشی سوپاو زۆری ئـامرازە شـەڕکەرەکانی دوژمن.
- ڕێزگرتن لە دیلەکانی شەڕ، بە ئازار نەدانو دابین کردنی شوێنی حەوانەوەی پێویست.
- دروست کردنی بواری گفتوگۆ، بەهۆی نامەنووسینو ناردنی خەڵکییەوە.
- نەرمی نواندن لە بەرامبەر دەست هەڵگرتن لە ئازاردانی خەڵك.
- ئازاد کردنی دیلەکانی دوژمن بەبێ بەرامبەر.

## چوارەم/ لەگەڵ لادێ نشینەکان.

- ڕێز لێنان لە ڕەوشتو دابو نەریتەکان.
- دەست وەرنەدان لە کێشەو کاروباری تایبەتی خەڵك.
- دەستی یارمەتی درێژکردن بۆ لێقەوماوانو بەپیرەوەچوونیان لە کاتی پێویست دا.
- یەك لایی کردنەوەی کێشەی نێوان گوندەکان لەسەر سنورو زەویو زاری یەکتری.
- ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی شەڕو ناکۆکیو پشێویی لە ناوچەکان دا.
- بەشداری کردن لە خۆشیو ناخۆشییەکانی خەڵك.
- ئیش کردن شان بەشانی گوندنشینەکان لە بەرهەم هێنانو دروێنەدا.
- پتەوکردنی پەیوەندیو دۆستایەتی لەگەڵ دانیشتوانی سنورەکەدا.
- گرنگی دان بە ڕۆشنبیرکردنو وشیارکردنەوەی لادێ نشینەکان.
- چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی خەڵك بە خۆڕایی.

## پێنجەم/ بە شێوەی جۆراوجۆر.

- نەریتی هاوخەباتی ڕەسەن لە بەرامبەر حزبو ڕێکخراوەکانی تری کوردستان.
- ڕێزگرتن لە هاوولاتیانی کەمینەی تورکمانو عەرەبو کەمایەتییەکانی تری عێراق.

- به پیرۆز تەماشاکردنی ئاین‌و مەزهەب‌و بیروباوەڕەکانی تر.

نەبوونی دەزگای بێ تەل، بۆشاییەکی گەورەی لۆجستیکی‌و ئیداریی لە نێوان مەفرەزەکانی پێشمەرگەو سەرکردایەتی‌دا دروست کردبوو، کە ئەئەمان لە هەرێم‌و ناوچەکان دا ئەیانتوانی لە دەنگ‌و باسی یەکتری ئاگادارین‌و لە شاڵاوەکانی هێرش‌و پەلاماردانی دوژمن دا داوای کۆمەك‌و پشتیوانی شەڕو پێداویستی‌یەکانی تەقەمەنی لە مەفرەزەکانی هاوسنوریان بکەن، نە سەرکردایەتی لەسەرەوە لەهەواڵی دەست‌و بردی چالاکی‌یەکانی پێشمەرگە لە شارو گوندو ناوچەو دەشتە جیاجیاکان دا بزانن‌و لە کاتژمێری دەست نیشان کراودا پەیوەندی بە خوارووی خۆیانەوە بکەن‌و بۆ ئەرك‌و ڕاسپاردەی نوێ ئاراستەیان بکەن. بەڵکوو بۆ چالاکی‌یەك سەرکردایەتی‌و مەکتەبی عەسکەری لە دوای دوو ڕۆژ یان زیاتر، هەواڵی شەڕو بەرەنگاربوونەوەو سەرکەوتنەکانی پێشمەرگەیان بە دەست ئەگەیشت‌و لەوێشەوە لە ڕێگای پەخشی ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان‌و بەلاغی عەسکەری‌و چاپەمەنی‌یەکانی ڕاگەیاندنی شۆڕشەوە بە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان ڕائەگەیەنرا. جاری واش هەبوو چالاکی‌یەك لە دوای هەفتەیەك بڵاوئەکرایەوە لە کاتێك دا مەفرەزەکە لە ئەنجام دانی شەڕێکی تری..پێشمەرگانەدا بووە.

بۆیە داهێنانی تەتەرو کارکردن بە تۆڕێکی گەیاندنی پەیوەندی لە نێوان هەرێم‌و سەرکردایەتی‌دا کە بتوانێ بەرەو ناوەند لە سەرێکەوە جانتاکەی پڕ لە هەواڵ‌و دەنگ‌وباسی دوژمن‌و چالاکی‌یەکانی پێشمەرگەو بەڵگەنامەکانی بەعس‌و گواستنەوەی پیتاك‌و کۆمەکی دۆستەکانی یەکێتی بکاتە کۆڵەپشتی‌و لە گەڕانەوەی‌دا هەمیش هەڵگری پەیام‌و ڕێنوێنی تازەو پێویستی‌و بڵاوکراوەکانی شۆڕش بێت‌و لایەنی کەم لەو قۆناغەدا بەشێك لەو بۆشاییانە پڕ بکاتەوەو بەشێکیش هەرێمەکان‌و سەرکردایەتی بیسپێرن بە هەڤاڵانی ڕێکخستن‌و خەڵکانێکی مەدەنی لە هێنان‌و بردنی نامەو چەك‌و بڵاوکراوەو نهێنی جۆراو جۆر بەرەو شارەکان‌و لەوێشەوە ڕەوانەی هەرێم‌و سەرکردایەتی‌و شوێنانی تر بکرێن‌و لەو پێناوەش دا چەندین هەڤاڵی تێکۆشەرو ژنانی کورد لە بازگەکان دا دەسگیر بکرێن‌و لە پاشان لە سێدارە بدرێن.



له بنچینەدا، هۆیەکانی پەرەسەندن و فروان بوونی شارەکانی کورد لە باشووری کوردستان دا، ئەوەندەی پەیوەندی‌یان هەبووە بە باروتۆخێکی سیاسی نەتەوەییەوە، نیو ئەوەندە پەیوەندی‌یان بە هیچ گەشەکردنێکی ئابوری و بەرەو پێشچوونێکی سەرمایەداری‌یەوە نەبووە. چونکە ئەو شارانەی لە مێژوودا بە هۆی فاکتەرەکانی بەرهەم هێنان و زۆربوونی کالاوشمەک و بازرگانی کردن و چڕبوونەوەی سەرمایە و گەشەکردنی بازاڕو کۆچ کردنی ئارەزوومەندانەی لادێ نشینەکان بووە بەرەو شارەکان و بەو هۆیانەوە وردە وردە شارە گەورەکان دروست بوون. لە کوردستان دا هیچ بنەمایەکی لۆژیکی‌یان نەبووەو لێرە هاوکێشەکە ڕێك پێچەوانە بووەتەوە. لەبەرئەوەی دەسەلاتداران هیچ کاتێك نەیان ویستووە ئەو کۆمپانیاو پرۆژە ئابوری و کارگە زۆرو زەوەندانەی لەچاو ناوچەی عەرەب نشینەکان دا هەبووە، بەهەمان شێوە لە کوردستان دا بکرێتەوە. یان بایەخێکی ئەوتۆیان بە ژێرخان و ڕەوشی ئابوری کورد نەداوە، هەتا بەو پێوەرانەی سەرەوە کۆمەلگاکەی گەشە بکات و شارەکانی فراوانتر بن. بەلکوو فراوان بوون و پەل هاویشتنی شارەکانی کورد لە دەرئەنجامی (٣) هۆکاری سەرەکی‌دا بەردەوام ڕوویەرەکانیان لە گەورە بوون و هەلکشان دا بووە.

## یەکەم/ هۆکاری بە زۆرەملێ‌ی ڕاگواستن بووە.

ڕاگواستن لەسەر سنورەکانی دەولەتی (ئێران، تورکیا، سوریا). بەناوی پاراستنی تەوەرە ستراتیجی‌یەکانەوە، بە تایبەتی لە نێوان کوردو عێراقی عەرەب دا. بە دەرکردنی جوتیاری کورد لەسەر ئاووزەوی و زارو کێلەگەکانیان. بە بیانووی پشکنین و گەڕان و دۆزینەوەی چالە نەوتەکان. دواتر بە هێنان و زۆرکردنی ژمارەی عەرەب بۆ شارەکانی کورد بووە.

## دووەم/ هۆکاری جەنگو کوشتار بووە.

کە هەموو ئاواییەکانی لەخۆ گرتووە، لە ئەنجامی لەشکرکێشی نەبڕاوەی دوژمن و بەرپابوونی شەڕو کاولکردن و تیاچوونی سەروماڵی خەلکەکەی‌دا کۆچێکی نائاسایی بەرەو شارەکان دەستی پێکردووە.

## سێیەم/ هۆکاری ترس‌و نائارامی بووە.

لە کوردستان دا. بە ئەندازەیەك خەڵکێکی لادێنشین لە شەستەکانی سەدەی رابردووەوە زێدی باوك‌و باپیرانی خۆیان بەرەو شارەکان بەجێ دەهێڵن، بۆ ئەوەی خێزانەکانیان لە ترس‌و دڵەڕاوکێی هێرش‌و پەلاماردانەکان دووربخەنەوە.

هەربۆیە فراوان بوونی ڕووبەرو زۆربوونی دانیشتوان‌و پەرەسەندنی خانووبەرەو باڵەخانە لە سەنتەری شارەکان دا، نەك هەرتەنها خەسڵەت‌و بنەماو ڕەگەزی شارە مۆدێرنەکانی سەردەمەکەیان تیا نەبووە، بەڵکوو لە بناغەدا دروست بوونی ئاوایی گەورە گەورەیان لێ کەوتۆتەوەو دانیشتوانەکەی پتر لە جاران گەرم‌و گوڕی هاتوچۆیان بۆ فەراهەم بووە لە پاشان بوونەتە رایەڵەیەك بۆ پەیوەندی کردن بە ئاواییە دوورەدەستەکان‌و لە ژیانی شارەکان دا هەمیشە بارگاوی بوونە بە کولتووری شاخ‌و نەریتی شۆڕشگێڕانەی پێشمەرگەو لە قۆناغ‌و سەردەمەکانی تری خەبات دا بوونەتە پێشەواو هەوێنی ڕاپەڕین و شۆڕش لەناو بزوتنەوە ئازادیخوازەکانی گەلی کوردستان دا.

ڕۆڵی شارەکانیش لە ڕێگای ئەم ناوەندانەوە بەرجەستە دەبوون:—

### ١/ ڕێکخستنی ناوشارەکان.

ڕێکخستن ئۆرگانی پەیوەندی کردن‌و سازدان‌و بەگەڕخستنی هەڤاڵانی تێکۆشەرو لەخۆگرتنی نیشتمان پەروەری نێو شارەکان بوو، بە مەبەستی دانانی بنکەیەکی جەماوەریی پتەو لەناو کۆمەڵانی خەڵك داو ئاراستەکردنیان بەپێی ئامانج‌و ویست‌و داواکارییەکانی سەردەمەکەو لە چوارچێوەی شێوە خەباتی ژێرزەمینیدا چالاکییەکانیان بەڕێوە ئەچوو. ئەم ڕێکخستنانەش بەر لە هەڵگیرساندنی شۆڕشی چەکداری کەوتبوونە کارکردن‌و لەلایەن کادرە پێشکەوتووەکانی یەکێتییەوە ڕیزەکانیان ڕێکخستبوو. دواتر کۆمیتەی شارەکانیان لێ کەوتەوەو توانییان لە زۆربەی شاروشارۆچکەکانی کوردستان دا کەرت‌و شانەکانی ڕێکخستنیان لێ دروست بکەن‌و لەپاشان پەل بهاوێن بۆ ناو ئەو شارانەی کە لە بنەڕەت دا دانیشتوانەکەی لە عەرەب پێکهاتبوون.

بەرلەوەی ئەندامێکی نوێ بۆ ناو ڕیزەکانی ڕێکخستن بانگهێشت بکرێ، شانەیەکی پەیوەندیدار لە سنووری جوگرافیاکەیدا، بەبێ ڕەچاوکردنی ڕەگەزی پیاو لە ژن، خوێندەوارو نەخوێندەوار، دەوڵەمەندو هەژار، مەزهەبو ئاین. هەڵسەنگاندنی وردیان لەسەر کەسایەتیو ڕەوشت جوانیو هەڵوێست پاکی هاووڵاتییەکە ئەکردو پاش بڕینی ماوەی تاقیکردنەوەکەش هەڤاڵە نوێیەکە وەرئەگیراو لە ڕیزەکانی ڕێکخستن دا متمانەیان پێ دەبەخشی. ئەرکو چالاکییەکانی سەرشانیان بۆی ڕوون ئەکردەوە.

ڕوبەری بە جەماوەریکردنی ڕێکخستنەکان، نەك هەر تەنها لە سنوورێکی دیاری کراوی خەڵك دا چالاکییەکانیان بەڕێوە ئەچوو. بەڵکوو فراوانتریان دزەکردن بووە بۆ ناو دامو دەزگاو دامەزراوەکانی دەوڵەت کە پێکهاتبوون لە خوێندنگاکانو بنکە تەندروستییەکانو فەرمانگەکانی خزمەت گوزاریو ئەو ناوەندانەی کە زۆرترین کارمەندیان لە چینو توێژەکانی کۆمەڵ تیا کۆببووەوە. لەلایەکەوە بۆ ئەوەی باشترین لەو کەسایەتییانە بهێنرێنە ناو ڕیزەکانی ڕێکخستنەوەو کەناڵێکی گەورەتر لە دامەزراندنی پەیوەندییەکان دروست بکەنو زیاتریش لەو بوارانەوە پەرە بە ڕێکخستنەکانیان بدەن. لە لایەکی ترەوەش بۆ ئەوەی لە کاتێك دا ئەو دامەزراوانە دەبنە هۆیەکی یارمەتیدەرو زۆرترین هەواڵی دوروونزیکیان لێ کۆئەبێتەوە، ئاهواش ببنە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوو پەی بە سیاسەتەکانی بەعسو جموجۆڵییەکانیان ببرێ.

پێویست بوو چالاکییەکانی ڕێکخستن هەم کارکردن بوایە بۆ پەرەپێدانی چەندێتی ئەندامەکانو هەمیش کۆشش کردن بوایە بۆ بەدەست هێنانی ئەوپەڕی چۆنایەتی پوختەو لە پرۆسەی وشیارکردنەوەو جۆشدانو بەگەڕخستنی هەڤاڵەکانیان دا بەردەوام ئەرکێکی ماندوو نەناسانە بگرنە بەرو هەروەها هەڵبسن بە کاری نهێنی پروپاگەندەکردنو لە مەفرەزەکانی ناو شارەکان دا ببنە پاڵپشتو پێشمەرگە ئاسا لە ڕووبەڕوی پەلاماردانەکان دا بووەستنەوەو شەڕی مانو نەمان بکەن. بەشێوەیەکی گشتی چالاکییەکانی ڕێکخستن لەم تەوەرانەدا خۆیان دەبینییەوە:—

— پەیوەندی کردن بە نیشتمان پەروەرانی نەتەوەوە.

- بەرزکردنەوەی ئاستی ڕۆشنبیری هەڤاڵەکانی ڕێکخستن بەباشترین شێوە.
- گەورەکردنی قەبارەو ڕوبەری شانەکانی ڕێکخستن بۆ ناوەندەکانی ترو شارەکانی دەوروپشت.
- نووسینی نامەی هەڕەشەو فڕێ دانیان بۆ ورپاکردنەوەی خۆفرۆشانی گەل.
- بڵاوکردنەوەی دەنگو باسی پێشمەرگە لە ناو کۆمەلانی خەلك دا.
- نووسینی سەر دیوار بۆ سەرپێچی کردن لە فرمانو بڕیارەکانی دەولەت.
- هەلواسینی پۆستەری شەهیدانو بڵاوکراوەی جۆراوجۆر لەسەر بارودۆخی کوردستان.
- پێشڕەوی کردنی جەماوەر بۆ بەرپاکردنی ڕاپەڕینی سەرتانسەری لە شارەکان دا.
- دەربازکردنی تێکۆشەران بۆ ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی پێشمەرگە.
- نووسینی ڕاپۆرت لەسەر ڕەوشی شارەکانو جموجۆلی دامو دەزگا ئەمنی‌یەکانی ڕژێم.
- فۆتۆکۆپی کردنی بەلگەنامەو نوسراوەکانی دوژمنو ناردنیان بۆ دەرەوە.
- دەست نیشان کردنی سیخوڕو ئەلقە لەگوێکان لە شوێنە جیاجیاکانی کوردستان دا.
- کۆکردنەوەی پیتاكو کۆمەکی دارایی بۆ هێزەکانی پێشمەرگە.
- پەیداکردنی داوودەرمانو چەكو پێداویستی‌یەکانی تەقەمەنی.
- گواستنەوەی بڵاوکراوەو نامەو تفەنگو دەمانچە بۆ ناوشارەکان.
- پێشڕەویو چاوساغی کردنی مەفرەزەکانی پێشمەرگە.
- تەقەکردن لە تاوانبارانو بنکەو بارەگاکانی بەعس.

بەهۆی تێکەلاوکردنی کاروباری ڕێکخراوەیی بە پرۆسەو بوارەکانی شەڕی پێشمەرگانەی ئەو کاتەوە، لە پڕێك دا شانەکانی ڕێکخستن ژمارەیەك لە ئەندامەکانیان دەسگیر ئەکرانو ئەودوای هەڤاڵەکانیشی بەر شالاوی گرتنو پەلاماردان ئەبوونەوەو ریزەکانی ڕێکخستن شیرازەکانیان تێك ئەچوو. هەروەك هەڤالانی دوور لە ڕووداوەکانیش مالانی خزمو ناسیاوەکانیان ئەکردە پەناگەیەكو بۆ ماوەیەك خۆیان لەبەر چاو ون ئەکردو تا ئەو کاتەش کە بۆیان دەرئەکەوت ناوەکانیان بەر شالاوەکە نەکەوتووە، جارێکی تر، ژیانی ئاسایی خۆیانو ڕێکخستنەکانیان دەست پێدەکردەوە. بەلام هەندێ لە هاوەلەکانیان دەستو برد ڕویان لە شاخەکان ئەکردو ئەبوون بە پێشمەرگە.

ئەوەی نیگەرانی‌یەکانی ڕژێمی زیاتر ئەکرد، ئەو بالادەستی‌یەی ڕێکخستنەکان بوون لە کارکردن دا، بەبێ ئەوەی دامودەزگا ئەمنی‌یەکان هیچ زانیاری‌یەکیان لەسەر شێوازی ئیش کردن‌و توانا نهێنی‌یەکانیان هەبێت‌و لە بەرامبەردا بتوانن ئەو چالاکی‌یانە پەك بخەن کە ئەوان لە بنەمادا ڕەوشی شارەکانیان پێ‌ی لەق کردبوو. بەو پێ‌یەش لە کاردانەوەیەك دا ویستیان چەندین لە لاوازانی کورد ویژدانیان بکڕن‌و بە پارەو دەم چەورکردن هانیان بدەن بۆ ئەوەی خۆیان بخزێننە ناو ئەو ڕێکخستنانەوەو لە دەست نیشان کردنی ئەندام‌و جموجۆڵی ناو شارەکان دا ڕژێمیان لێ ئاگادر بکەنەوە. بەلام هەر زوو ئەو تەقەلایانە لەبار ئەچوون‌و بۆ تێکۆشەران ڕوون ئەبووەوە کە پیلانێکی لەو جۆرە خراوەتە گەڕو ئەیانەوێ پەی بە پاکی‌و سەنگینی ڕێکخستنەکان بەرن‌و ڕیزەکانیان لێ هەڵبوەشێننەوە. لە دامەزراوە مەدەنی‌یەکانیش دا چەندین گەراو تۆڕی سیخوڕی‌یان دەست چێن کردو لە باروداۆخێکی نائاسایی‌دا کارمەندە کوردەکانیان ئەخستە ژێر چاودێری وردەوەو بە چاوی پێشمەرگەو یاخی بووان لە دەوڵەت مامەڵەیان لەگەلا ئەکردن.

## ٢/هەڵوێستی ڕوناکبیرانی نەتەوە.

مێژوو شایەتی ئەو ڕابردووە بووە کە هەموو وەرچەرخان‌و پێشکەوتنی کۆمەڵگایەك لەسەر دەستی ژمارەیەك لە بیرمەندو پێشکەوتنخواز بگیرسێتەوەو بەبەرنامەو تیۆری شۆڕشگێڕانە ئەو داب‌و نەریت‌و یاساو ڕێسایانە بگۆڕن کە سەرجەم کۆمەڵگاکانیان لەسەردەمە جیاجیاکان دا پێ‌ی ئالوودە کرد بوو. هەر لە ڕێگای نووسین‌و دراماو چیرۆك‌و شانۆو شیعرەوە بەرەنگاری هەموو پێشێلکاری‌و جەورو چەوساندنەوەیەکی ڕەگەزی‌و ئاینی‌و مەزهەبی‌و چینایەتی ببنەوەو لە دەسەلاتداران ڕەخنە بگرن‌و کاروکردەوەکانیان سووك‌و ڕیسوا بکەن. بە سەدان کتێب‌و شاکاری زیندوو لە بوارەکانی هونەرو وێژە لە دوای خۆیان بەجێ بهێڵن‌و گەلانی ئازادیخواز کەڵك لەوانەو پەندەکانیان وەربگرن.

هونەرو وێژە، لە کاتێك دا وێنەیەکی فۆتۆگرافی لە ژیان‌و ئێش‌و ئازارەکانی کۆمەڵگایەك بەرجەستە ئەکەن، لە هەمان کاتیش دا ئەبنە ئامرازێکی گرنگی وشیارکردنەوەو کۆمەلانی خەڵك بەردەوام بەو گیانە ڕق ئەستورە بارگاوی دەکەن کە بێجگە لە تێکشکاندنی ئەو دام‌و

دەزگایانەی بوونەتە هۆکاری دروست بوونی بارودۆخەکەو گوزەرانیان بەرەو خراپیو ئەوپەڕی ئاڵۆزی بردووە، هیچ چارەسەرێکی تر جێگایان نەگرێتەوە. دیارە ئەرکێکی وا مێژوویی تەنها لەسەر دەستی ڕوناکبیرانی نەتەوە ئەنجام ئەدرێ کە بتوانن بەهرە لە تاڵیو تفتی ڕوداوەکان وەربگرنو ئەو ناوەندانەی هونەرو وێژەش بە باشترین شێوە ئاراستە بکەن.

لە دەیەی هەشتکان دا، ڕۆڵی ڕوناکبیرانی کورد جێگایەکی پڕ لە بایەخیان لەبەرگریو هاوهەڵوێستی نەتەوەییدا تۆمار کردووە. هەوێنی چالاکییەکانیان هەزرو زادەی ئەو ڕووداوانە بوون کە چۆن ستەمکارانو خوێن خۆری گەلان مێژوویەکی تراژیدیان لە کوشتنو داپڵۆسین دەرهەق بە مرۆڤایەتی پەیڕەو کرد بوو، لە ئەنجام دا ڕوبەڕوی نارەزاییو تووڕەیی جەماوەر بوونەتەوەو بۆ هەتا هەتا شکست چارەنووسی تەختو تاراجیان بووە، هەر ئاهواش نموونەیان لە چاوەڕێی بەختو چارەنووسی ڕەشو ئەو دوای ڕژێمە دیکتاتۆرییەکان پێشکەش دەکرد کە لە دواجاردا ناویان بچێتە ناوخانەی مێژوویەکی لەیاد چووەوە. بەو پێیەش باجی ئەو چالاکییانە گرتنو ڕاوەدونانو بێ سەرو شوێن کردنی زۆر لە نوسەرانو هونەرمەندان دەبوو. هەروەها چەندین لەو ڕوناکبیرانەش لە بارودۆخی جیاجیادا ڕوو بکەنە شاخو ببن بە پێشمەرگە.

شیعری بەرەنگاری، ڕوبەرێکی فراوانیان لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو دەمەی عێراق دا بەرجەستە ئەکرد. نوسەرانی کورد لە تاقیکردنەوەیەکی کەم وێنەدا بە دەیان لێکۆڵینەوەو نامیلکەو کتێبی جۆراو جۆریان لەسەر شیعرو شاعیرو هەڵوێستیان لە خەباتو بەرگریدا بڵاونەکردەوە. چ جای ئەو کۆڕە ڕۆشنبیرانەش کە لە نێو شارەکان دا بەڕێوە ئەچوون، زۆرترین کاردانەوەیان لەسەر لاوەکان بەجێ ئەهێشتو پاڵیان بە چەندین خامەی تێکۆشەرەوە ئەنا بۆ ئەوەی لەو پێناوەدا بنووسنو نەفرەت لە هەموو چەوسانەوەو لە جەورێکی داگیرکەران بکەنو جەماوەر بۆ شۆڕشو یاخی بوونی گشتی هان بدەن. ئەوەیش کە بوارەکەی لە چەندین لاوە ڕەخساند بوو نووسین بوو لەسەر ئیمپریالیزمو ناشیرین کردنی ئیستعماری کۆنو تازەلە تەك ئەو قەیرانە برسێتیو ئازارانەی کە ڕوبەڕوی جیهانی سێیەم بووبوونەوە. هەروەها کێشەی بەردەوامی فەلەستینییەکانو

شۆڕش‌و ڕاپەڕینەکەی گـەلی کوردسـتانی ئـەودیو، زیـاتر ئـەو ئاسـانکارییانە برەخسـێنێ‌و ڕووداوو کارەساتەکانی ئێرە تێکەڵاو بە ئێش‌و ئازارو مەینەتی‌یەکانی ئەوێ بکەن.

هەر لـە ئـەنجامی پـەیوەندی کردنـی ڕێکخسـتنەکانی (ی.ن.ك) بـە ژمارەیـەك نوسـەری نیشتمان پەروەرەوە، بووە هاندەرێکی سەرەکی بـۆ بانگهێشت کردنـی دەیـان ڕوناکبـیری تری کورد لە شاعیرو چیرۆك نووس‌و ئاوازدانـەرو ئەکتـەرو تـابلۆکێش‌و هونەرمـەند بـۆ نـاو ڕیزەکانی ڕێکخستن. لە لایەکەوە ئەو بوارانەی هونەرو وێژە بە زمان‌و گیانێکی شۆڕشگێڕی ئاراستەی خوێنـەران‌و گوێگرانیـان بکـەن‌و ژیـانی ژێردەسـتەیی‌و کۆیلایـەتی‌یان بـۆ ڕوون بکەنەوەو جەماوەری ستەم دیدە لـە دەسـەڵاتداران بوروژێنـن، لەلایـەکی تـرەوە بەرهـەم‌و بابەت‌و نووسین‌و لێکۆڵینەوەکانیان بنێرن بۆ شاخ‌و لـەوێ بڵاویکرێنـەوە. لەوانـەش شـیعرو شاعیریی‌و کەسێتی (جوامێر)٤ دەرکـەوت‌و توانـی شـوێنێکی دیـار لـە شـیعری بـەرەنگاری شۆڕشی شاخ دا بەرجەستە بکات‌و جۆش بداتە وورەو باوەڕی پێشمەرگەو کۆمەڵانی خەڵك. هەر لە ناوچەکانی بن دەسەڵاتی میرییەوە تابلۆی هەڵمەت‌و پەلاماردانـەکانی پێشـمەرگەی وێنا ئەکردو پەردەی لەسەر سیاسـەت‌و کـردەوەو ڕەفتارەکـانی ڕژێـم هـەڵ ئەدایـەوە. لـە شـیعرێکی کاریکـاتێریدا بـەمجۆرە مامەڵـەو هـەڵس‌و کـەوتی پیـاوانی بەعسـی دەرهـەق بەهاووڵاتیانی کورد ئەخاتە ڕوو:-

بەیانی بوو لە (کانێسکان)

بەچاوی خۆم:

(قەعقاع)م دی

بروسکەیەو شاڵاو ئەبا

ئازا .. ئازا

هەرخۆی ئازا

دێتە پێشێ

---

[4]) کەسێتی (جوامێر) نـاوی نـهێنی (شـێرکۆ بێکـەس)ی شـاعیر بـووە، بـەر لـەوەی پـەیوەندی بکـات بـە هێزەکانی پێشمەرگەوە، بەو ناوەوە شیعری ئەنارده دەرەوە.

قژی کچێکی قوتابی

سیانزه ساڵان ڕائەکێشێ

هەلهوله.. هەلهوله.. هەلهوله.

نیوەڕۆ بوو له ناو قەیسەری نەقیب دا

بەچاوی خۆم:

(سەعدی کوڕی وەقاص)م دی

تیر له چاویەوه ئەباری.

له بازاڕی مانگرتوودا

قفڵی دوکانێکی شکان

چووه ژوورێ

ئازا ئازا

وەختێ لەو سەر هاته دەرێ

ئارەقی زۆری ڕشتبوو

بەم دەست چەند تەبەقێ هێلکەو

بەو دەستی تر چەکەکەی خۆی

هەڵگرتبوو.

هەلهوله.. هەلهوله.. هەلهوله.

لەبەرەی هاوپەیمانی نەتەوەیی‌دا، ڕۆڵی هونەرمەندان هیچی له بایەخ‌و ڕۆڵ‌و ئەرکەکانی ئەو دەمەی شاعیرو نوسەرو ڕوناکبیرانی تری کورد کەمتر نەبووە. بەڵکوو چالاکیە هونەرییەکانیان بریتی بوون له نمایش کردنی ئەو ئازارو مەینەتی‌یانەی خەڵك که هەمیشه تاڵی‌و جەوریان بە دەست فەرمانڕەوا کۆن‌و تازەکان چەشتوو بوو. بەو پێیەی شان بەشانی ئەو بارودۆخە سیاسی‌و ئەتنیکی‌یەی کوردستان بڕۆن‌و کاریگەرییەکانی هونەر له بواره جیاجیاکان دا بسەلمێنن. هەروەها ئەو ناوەندانەی هونەر له خزمەتی جەماوەری بەرفراوان دا بخەنە گەڕو بڕیار لەسەر پاکی‌و زیندوێتی چالاکی‌یەکانیان بدەن. ڕێگا ئەدەن بە هاوەڵ‌و ئەو کەسە لەڕۆکانەی که دەیانویست هونەرەکەیان بکەنە دەسکەلای ڕژێم‌و بە

شان‌و شکۆی صدام‌و شەڕە بێ بنەماکەی‌دا هەڵبدەن. لە پاشان چەندین نمایشنامەو دەقی شانۆگەری وروژێنەر لە شارەکان دا پێشکەش بکەن‌و بە دەیان پۆستەرو تابلۆی ژێـر بـاری ستەم‌و زۆرداری بە پـەرەمووچی هونەرمـەندان بخرێنـە ڕوو، هـاوارێکی پـڕ بـەدەم لـە دژی دەسەڵاتداران‌و ماف زەوت کەرەکانی سەروەخت ئاراستە بکەن.

ئەو چالاکی‌یانـەش، بـێ سەرنێشـە و قوربـانی‌دانی نوسـەران‌و هونەرمـەندان بـەڕێوە نەئەچوون، بەڵکوو بەردەوام ئەکەوتنـە نـاو تـۆڕی دام‌و دەزگـا سیخوڕی‌و پۆلیسـی‌یەکانی بەعس‌و بە بیانووی پەیوەندی‌و هاوکاری کردن لەگەڵ یاخی بـوان دا ڕووبەڕووی ڕاوەدونـان‌و گرتن‌و ئازاردان ئەبوونەوەو لە پاشان ژمارەیـەك لـە دەربـاز بـووان ڕوویـان ئـەکردە شـاخ‌و چەکی پێشمەرگایەتی‌یان لەشان ئەکرد. بەو بۆنەیەوە سالّی (١٩٨١)، (یـەکێتی نوسـەرانی کوردستان)یان دامەزراندو دوابـەدوای ئـەوەش چـەندین بابـەت‌و نووسـین‌و گۆڤـارو کتێـب‌و نامیلکەی جۆراو جۆریان لە بوارەکانی هونەرو وێژە بـە چـاپ گـەیاندو بڵاویـان ئـەکردەوە. هەر لەو ساڵەش دا لە لایەن پێشمەرگەو هونەرمەندانی شـاخەوە (تیپـی مۆسـیقای شـەهید کارزان)و (تیپی شانۆی شـۆڕش)یـان دروسـت کـردو دواتریـش زەمینـەیان بـۆ دامـەزراندنی (یـەکێتی هونەرمـەندانی کوردسـتان) لـە سـالّی (١٩٨٣)دا خـۆش کـرد. هـەروەك توانی‌یـان پەیوەندی‌یەکانی خۆیان لەگەڵ نوسەران‌و هونەرمەندانی دەرەوەو نـاوەوە پتـەوتر بکـەن‌و ڕیزەکانیان ڕێك بخەن.

ئەوەی لە هەشتاکان دا جێگای سەرسوڕمان بوون، ئەو لێشاوەی کتێب‌و چاپەمەنی‌یانـە بوون کە لەسەر دەستی ڕوناکبیرانی کورد لە بابـەتی شـۆڕش‌و خـەبات‌و ئـەزموونی گـەلانی بندەسـت‌و لێکدانـەوەی فەرهـەنگو زاراوەو سیسـتەمە سیاسـی‌یەکان‌و سـەرخان‌و ژێرخانەکانی کۆمەڵدا بڵاو ئەبوونەوە، بەبێ ئەوەی تا ئێستا لە ژێر سـایەی هیـچ ڕژێمێکـی دیکتاتۆری‌دا ئەو شێوازەی ڕۆشنبیرکردنی جەماوەر بەدی بکرێ. لە کاتێك دا دەسەڵاتداران بـە دەسـتی خۆیـان گـۆڕ بـۆ خۆیـان هەڵبکـەنن. ئەمـە لەلایەکـەوە، لـە لایـەکی تـرەوە تۆمارکردنی زنجیرە نمایشـی تەلـەفزیۆنی (ژاڵـە)و (قاسـپەی کـەو) بـوون کـە نـاوەڕۆکێکی شۆڕشگێڕی‌و یاخی‌بوونیان هەبوو لە دژی حوکمڕانانی کۆنەپەرست‌و داگیرکەرەکان، کە لەو ڕۆژگارەدا هەستی نیشتمانی‌و نەتەوەییان بۆ شۆڕش‌و ڕاپەڕین بەرجەستە ئەکرد.

## ٣/ یەك دەنگی چین‌و توێژەكانی كۆمەڵ.

ئەو كاتـەی سـتەم‌و داگیركردن بـەرۆكی نیشـتمان‌و نەتـەوەو ئـازادی دەگـریێ‌و تیـایدا گەورەو بچووك بە ئاگرەكەیەوە ئەسوتێنێ، ئەو دەمـە هیـچ ڕێگایـەك لەبـەردەم كۆمـەڵانی خەڵك دا ناهێڵێتەوە بێجگە لە هاوپەیمانی‌یەك نەبێت كە تێكڕای چین‌و توێژەكانی كۆمـەڵ لەخۆی بگرێت‌و لەو پێناوەدا شكۆی جاران بۆ خاك‌و خەڵك‌و خاوەنەكەی بگەڕێنێتەوە. بەو پێ‌یـەش لـە قۆنـاغی بزوتنـەوەی ڕزگـاریخوازی‌دا گـەل دابـەش دەبـن لـە نێـوان بـەرەی تێكۆشەرانی سەنگەرو پاڵپشت دا كە هەموو توانـا مرۆیی‌و واتاییـەكانیان ئەخەنـە بازنـەی یەك چارەنووسی هاوبەشی نەتـەوەوە، لەوانـەش یـەكێتی وتـارو خـەمی هاوبـەش‌و سـۆزی ویژدان‌و بیركردنەوە هاوپەیمانی‌یەكە ڕێك دەخەن‌و كۆمەڵگا بەرەو ئامانجە دێرین‌و تازەكان هـەڵدەنێن‌و دیـاردە درێـوو بێزراوەكـان ڕەت دەكەنـەوە كـە ناوبـەناو لـە لایـەن گـروپ‌و ئەندامانی خودی كۆمەڵگاكەوە لە سەردەم‌و كات‌و هەلومەرجی جیاجیادا سەر هەڵدەدەن.

چینی ڕەنجدەرانی كورد، كە فراوانترین چینـی چەوسـاوەو تێكۆشـەری كۆمـەڵگا بـوون، هەر لەسەرەتاوە تێكـەڵ بـە ڕێكخسـتنەكانی (ی.ن.ك) بـوون‌و مافـەكانیان لـە سەریەسـتی كوردسـتان‌و چـین‌و توێژەكـانی‌دا دەبینی‌یـەوە. دامـەزراوە حكومـی‌و ناحكومی‌یـەكانیان كردبووە ناوەندی ئیش كردن‌و هاوپیشەكانیان لە دژی كاربەدەست‌و ڕژێمە فەرمانڕەواكـەی بەعس ئەوروژاند. لە چەندین خۆپیشاندانی گشتی‌دا ئەڕژانە سەر شەقامەكان‌و بۆ ڕاپەڕینی جـەماوەریی پێشـڕەوی‌یان ئـەكرد. ئـەم چینـەش تەنـها بـەوەوە نەوەسـتاون، بـەڵكوو بـە سەدانیان ڕووی ئەكردە شاخ‌و چەكی پێشمەرگایەتی‌یان لە شان ئەكرد. بە دەیان لەوانەش كەڵەپیاوی عەسكەری‌و سیاسـی‌یان تیـا هـەڵ ئەكـەوت‌و گیـانی خۆیـان لـە پێنـاو پـیرۆزیی ڕێبازو بیروباوەڕەكەیان دەبەخشی.

لە خوێندنگاكـان دا، ڕۆڵـی مامۆسـتایان‌و قوتابیـانی كـورد لـە نـاو ڕێكخسـتنەكانی (ی.ن.ك)دا بەرجەستە بوون. لەسەر دەستیان چەندین شانەی ڕێكخستن لە نـاو قوتابخانـە سەرەتایی‌وناوەندی‌و ئامادەیی‌و پەیمانگاو كۆلێژەكان دا موتوربە كران‌و بە دەیان لۆست‌و لایەنگریان لەدەوری خۆیان كۆكردبووەوە كـە ئـەیانتوانی لـە وەخـت‌و نـاوەخت دا ڕەوشـە

سیاسی‌یەکەی حکومەتی فەرمانڕەوا بشێوێننو ڕاپەڕین و خۆپیشاندان لە نێو شـارەکان دا بەرپا بکەن. لە کاتێك دا زۆرێك لە هەڤاڵەکانیان دەسگیر ئەکرانو هەندێکی تریان ڕوبەڕوی ڕاوەدونانو گرتن ئەبوونەوەو هەروەها هەندێکی تریان پەیوەندی‌یان ئـەکرد بـە هێزەکـانی پێشمەرگەوەو لە شاخ دا کۆمەڵەو ڕێکخراوی تایبەت بە خۆیان دروست کرد.

توێژی ژنان، بە پێی توانا جەسـتەیی‌و کۆمەڵایەتی‌یـەکانیان، ڕۆڵـی خۆیـان لـە چـەندین بواری پێشمەرگەیی‌و ڕێکخراوەیی‌دا بینی‌و هاوکات لەگەڵ هەڵگیرسانەوەی شۆڕش دا شـان بەشانی هاوسەرە پێشمەرگەکانیان چوونە شاخ‌و سـەنگەری مـان‌و نـەمانیان هـەڵبژارد. بـە کردەوەش لـە دەیـان نەبـەردی‌و پێکـادان دا بوونـی خۆیـان سـەلماندو بەرگـەی ڕۆژگــارە سەخت‌و دژوارەکانیان گـرت‌و تـاڵی‌و تفتـی زۆری نـاو زینـدان‌و گرتووخانـەکانیان چەشـت. ژنانی کورد لـە شـاخەکان دا وەك چۆن ڕۆڵـی دایـك‌و خوشـك‌و هاوسـەریان بـۆ ڕۆڵـەو بـراو مێردەکانیان دەبینی، هەر ئاهواش لە شارەکان دا تەتەرێکی مـاندوو نەناسی سـەر ڕێگـای هـات‌و نـەهات بـوون بـۆ گواسـتنەوەی چـەك‌و نـارنجۆك‌و تەقەمـەنی‌و نامـەو پۆسـتەرو بڵاوکراوەکانی شۆڕش بۆ ناوەوەی شارەکان‌و لەوێشەوە گەیاندنی دەنگوباس‌و بەڵگەنامەو زانیاری‌یەکان بۆ دەستی هێزەکانی پێشمەرگە. هەروەها زۆرێك لە کچانی کورد بڕیاریـان دا بوو کە شـوو تەنـها بـە پێشـمەرگە بکـەن‌و مـارەیی زۆرو داواکـاری بـێ بنـج‌و بنـەوان ڕەت بکەنەوە.

کلتوری شاخ، زۆر بە خێرایی تێکەڵ بە ژیان‌و هەڵس‌و کەوتی ڕۆژانەی خەڵکی شـارەکان بوو. قسەوباسی پێشمەرگەو چالاکی‌یەکانیان ببووە بابەتی سەرزارو لەسەر شەقام‌و شوێنە گشتی‌یەکان‌و لەنێو قوتابخانەو دام‌و دەزگا حکومەیـەکان دا زوو بـڵاو ئەبوونـەوە. کۆمـەڵی کوردەواری وا لێکرد بوو هەر لەناونانی منداڵێکی تازەی لە دایك بووەوە هەڵبسێ منداڵەکـەی بەناوی شەهیدو کادرو پێشمەرگە هەڵکەوتووەکانی یەکێتی‌یەوە ناوبنێ، هەتا ئەو ڕادەیەی جۆرو شێوازی جلوبەرگ لەبەرکردن‌و دانانی ڕیش‌و لە پشت کردنی پشتێوێنی پان‌و لە شـان کردنـی پەسـتەك‌و لەسـەر کردنـی کـڵاوو جامانــەدا، مۆرکێکـی زاڵـی ئـەو دەمـەی دابـو نەرێتەکانی پێشمەرگە لە خۆیان بگرن.

بەرهەمی ڕاپەڕین، یەکێك بوو لە دیارترین وتارە زیندووەکانی نەتەوە کە تیایدا سەرجەم پێکهاتەی چین و توێژەکان ئەوپەڕی لافاوی توڕەیی خۆیان هەڵڕشت و بەرەنگاری سەرسەخترین داگیرکەری مێژووی کوردستان بوونەوە. بە ئەندازەیەك لە بەهاری (۱۹۸۲)دا لوتکەی ڕاپەڕین هەموو شارە گەورەکانی وەك (سلێمانی و کەرکوك و هەولێر)یان گرتەوە و ڕژێمە سەربازییەکەی بەعسیان بۆ چەندین داواکاری و مەرجی خۆپیشاندەران ملکەچ کرد کە دواتر ئەو ڕاپەڕینانە بە شێوەی جیاجیا سەرکوت کران و خەڵکە ڕاپەڕیوەکەی دوچاری گرتن و ئەشکەنجەدان و گوللەباران کردنی سەرجادەکان بوونەوە و ژمارەیەك لەوانەش ڕوویان کردە ناوچە ئازادکراوەکان و لەوێ نیشتەجێ بوون، هەندێکی تریان چەکی خەبات و شۆڕشیان لەشان کرد و بوون بە پێشمەرگە. هەر لە هەشتاکان دا چەندین خۆپیشاندان و هەڵمەتی ڕاپەڕین لەگەڕەك و شار و ڕوبەرێکی دیاریکراودا بەرپا بوون، بەڵام هیچیان پریشکی ئاگرەکەی لە یەك کات دا ئەو دوای شار و شارۆچکەکانی نەگرتەوە کە بتوانێ زۆرترین جەماوەر بهێنێتە سەر شەقامەکان و شۆڕشە چەکدارییەکە بگۆڕێ بۆ شێوازێکی تری خەبات. کە گرنگترین هۆکاریش لە پشت سەرهەڵدانی ئەو ڕاپەڕینانەوە بوون، خۆیان لەم تەوەرانەدا دەبینییەوە:—

- پێشڕەوی هەڤاڵانی ڕێکخستن بۆ ئەنجام دانی پرۆسەی ڕاپەڕین بەشێوەیەکی گشتی.
- زەبروزەنگی لە ڕادەبەری ڕژێم و سیاسەتی بە عەرەب کردنی وانەکانی خوێندن.
- زەمینەی ڕاگواستن و نیشتەجێ کردنی ئاوابیەکان لە ئۆردوگا زۆرەملێکان دا.
- لە بۆنە جیاجیاکانی نەورۆز و بەهاری سەری ساڵ دا.
- بە هۆی ساڵڕۆژی شەهید بوون و کارەساتەکانی نەتەوەوە.



لەبەرئەوەی گەلی کورد، تاکە دۆستو پشتیوانی دەرەکی نەبووە هەتا سەرو دەوڵەتانی دەرودراوسێ لەسەر دامرکاندنەوەی هەر بزوتنەوەیەکی سیاسی کورد لە ناوچەکەدا یەکێتییەکی ستراتیژییان هەبوە. بۆیە (ی.ن.ك) لەسەرەتاکانی دەست پێکردنەوەی خەبات دا ئەو هاوکێشە دژو ناحەزانەی خوێندەوەو هەڵوێستی لە بارەیانەوە وەرگرت. بڕیاریدا کە تاکە پشتو پەنای شۆڕشەکە ئاوایییەکانو سەختی چیاکان بێتو لە دژوارترین ڕۆژگاردا ڕەدوی سیاسەتەکانی ئەم وڵاتو ئەو ناوەند نەکەوێ. لەسەر بناغەی هەرەپێویستی ئاووبوونی ماسییەکە شۆڕشێکی نەتەوایەتی درێژخایەنو پشت بەستوو بە تواناکانی گەل بەرپا بکرێ. ئیتر لەو ڕۆژەوە ئاوایییەکان بوون بە لانکەی شۆڕشو چیاکان بە بنکەو ماڵی پێشمەرگەو چارەنووسی شۆڕشو ئاوایییەکان بە توندی گرێدران بەیەکترییەوە.

سەرزەمینی ئاوایییەکان، ئەو شادەمارو خوێنەی نیشتمان بوو کە زیندوێتیو گیان ببەخشێ بە شۆڕشێکی تازەو لە کورترین ماوەدا تەمەنی لە دایك بوونو پێگەیشتنی لە باوەش بگرێ. دانیشتوانەکەی لە دەوری ئامانجەکانیدا کۆ بکاتەوەو زۆر بە ئاسانی لە پرۆژەو بەرنامەکانی تێ بگەن. داستانی کەم هاوتای شەڕو پێکادانی پێشمەرگەو تێکشکاندنی دوژمنەکانیان لەسەر ئەنجام بدەن. لە ڕۆڵەکانیان نموونەی باشترین تێکۆشەر لە گۆڕەپانەکانی نەبەردیدا گیان بەخت بکەن. هەروەها گرنگترین بایەخی ئاوایییەکان لە (٣) بواردا بەرجەستە دەبوون، کە ئەمانەن:-

### ١/ لە ڕووی ڕێکخراوەییەوە.

لەسەرو بەندی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش دا، ئاوایییەکان بوون بە تاکە سەکۆی چالاکییە نهێنیو ئاشکراکانی ڕێکخستنو کادرەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کەوتنە جمووجۆڵی سیاسیو پەیوەندییان کرد بە نیشتمان پەروەرانی نێو ئاوایییەکانو لە شانەبەندی جیاجیادا ڕێکیان خستن. توانییان ڕکێفی ئەو پاشەگەردانییە ئەمنیو کۆمەڵایەتییانە بکەن کە داگیرکەر بە تۆڕی نۆکەرایەتیو سیخوڕی ئاوایییەکانی پێ ناشیرین کرد بوو. زەمینەیەك کە تیایدا وێنەو وانەکانی کوردبوونو کوردەواری تیا زیندو بکەنەوەو کۆمەڵانی خەڵك بەرەو گۆڕەپانەکانی شۆڕشو گیان بازیی پێشڕەوی بکەنو دوودڵیو ساردی ئەو بارودۆخە گڵاوە

بڕەوێننەوە کە بڕوای بۆ ژیانەوەی شۆڕشێکی تازەو بۆ سەرکەوتنی جولانەوەی کورد لە ئایندەدا لەق کرد بوو. کە دواتر ڕۆڵی ئاوابیەکان پەیوەندییەکی تۆرگانی دووسەرەی لە نێوان ڕێکخستنی شاخ و شارەکان دا دروست کردو چالاکییەکانیان وزەی شۆڕشگێڕانەو تین و تاوی نیش کردنی تازەی پێیان بەخشی.

ڕێکخستنی ناو گوند، ئەرکەکانی زۆرو شێوازی کارکردنی جۆراوجۆر بوون. بە تایبەتی ئەو کاتەی کە هێشتا مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕش لە تافی خۆشاردنەوەو لە شوێن و جێگاگۆڕکێ بوون بە درێژایی ڕۆژ. بۆ ئەم مەبەستەیش ئەرکی مشورخواردن و ئیدارەدانی پێشمەرگە، لە ڕووی خۆراک و دابین کردنی تفاقی شەڕەوە لەسەر شانیان بوو کە دەبوایە ئەندامانی ڕێکخستن وێڕای جێبەجێکردنی چالاکی ڕێکخستن و ئاشکرا کردنی سیخوڕو پیاوانی بەعس لە ناوچەکەدا پێی هەڵسابانایە. بۆیە ڕێکخستنەکان کە هەردەم چاوو گوێی متمانەپێکراوی پێشمەرگە بوون، بە کۆشش و تەقەلایەکی زۆرەوە لە هەوڵی ئەوەدا بوون کە بێ بەبەشە برای سەنگەرو هەڵگری ڕێبازە ماندوو نەناسەکەی پێشمەرگە لە گواستنەوەو گەیاندنی کۆڵەپشتی نان و پرپاسکەی خواردن بۆ بنکەو پەناگاکانی خۆشاردنەوە لە شوێنی دیاریکراودا. هەروەك بە سازدان و کۆکردنەوەی هێزی یارمەتیدەرو بە هاناوەچوون لە چەند لایەکەوە بۆ تێکشاندنی دوژمن لە ناو گەرمەی شەڕو پێکادانەکانی پێشمەرگەدا. شان بە شانی ئەوەش شانەیەکی ڕێکخستن لە سنوری ئاوایبەك دا چەند ڕاسپاردەو ئەرکێکی لەسەر شان بووە کە دیارترینیان ئەم چالاکییانە بوون:—

— کۆکردنەوەی زانیاری و بەدواداچوون لەسەر هێزو ڕەبایەو چەك و تفاقی شەڕکردن و جموجۆڵی سوپاکەی ڕژێم.

— لەخۆگرتن و دڵدەدانی پێشمەرگەی بریندارو نەخۆش و پەیداکردنی دەرزی و گولاج و حەپو داوودەرمانی پێویست.

— پێشڕەوی و چاوساغیکردنی هێزەکانی پێشمەرگە لەسەر جادەو بۆ سەر ڕەبایەکانی دوژمن.

— دەستەبەرکردنی هۆیەکانی گواستنەوە لەکاتی ئەنجام دانی هەر چالاکییەکی پێشمەرگەییدا.

- بوون بەتەتەر لە نێوان پێشمەرگەو ڕێکخستنەکانی سەرەوە بۆ هێنان و بردنی نامەو دەنگوباس و بڵاوکراوەکانی شۆڕش.
- گواستنەوەی کەلوپەلی فریاگوزاری و پزیشکی لە شارەکانەوە بۆ مەفرەزەو خەستەخانەکانی شۆڕش لە ڕێگای کۆڵەپشت و تراکتۆرەوە.
- پووچەڵ کردنەوەی پڕوپاگەندەو دڵەڕاوکێ لەسەر باروودۆخ و دیاردەکانی لەشکرکێشی سوپا بۆ ناوچەکە.
- بە کڕینی پێداویستییەکانی پێشمەرگە لە چەك و تاخم و تەقەمەنی و هەڵگرتنیان لە حەشارگەی نهێنیدا.
- لە هەوڵی دابین کردنی پیتاك و خەرجی ڕۆژانە بۆ هێزەکانی پێشمەرگە لە ئەندام و دۆست و لایەنگرەکانی شۆڕش.
- بوون بە ڕابیەڵەی پەیوەندی کردن لەنێوان پێشمەرگەو خێزان و کەس و کاردا.

بۆیە کێوماڵ کردنی پێشمەرگە، و دابڕینی پەیوەندی لە نێوان شۆڕش و ئاوایییەکان دا، یەکێك بووە لە سیاسەتە دێرینەکانی بەعس و لە سەرەتاکانی شۆڕش دا بە سەدان ڕووی ئاوەدانییان لەسەر سنورەکان چۆڵ کردو دانیشتوانەکەیان بەرەو ئۆردوگاکانی زۆرەملێ گواستەوە. هەر شاخ و لوتکەیەکی چیایان کرد بە سەربازگەو بڕیاری قەدەغەکردنیان بۆ مانەوەو نیشتەجێ بوون لە ناوچەکان دا دەرکرد. بەو پێیەش لەسەرەتاو ناوەڕاستی دەیەی هەشتاکان دا پەلوپۆی ئەو سیاسەتە دەوروبەری شارو شارۆچکەکانی گرتەوەو لە کاولکردنی ئاوایییەکان و گرتن و ڕاونان و تیرۆرکردنی دڵسۆزانی نەتەوەدا درێغییان نەکرد. هەروەها لە پرۆسەکانی ئەنفال دا هەموو ئاوایییەکان بەر شاڵاوی ئەو سیاسەتە کەوتن و بە بلدۆزەرو دینامێت لەگەڵ خاکەکەیدا یەکسانیان کردن.

## ٢/ لە ڕووی پێشمەرگایەتییەوە.

گوندنشینەکان، هێزێکی مرۆیی پاڵپشت بوون. لە هێرش و پەلاماردانەکانی پێشمەرگەدا چاوساغ و تفەنگ لەشان بوون. لەگەرمەی شەڕەکان دا مەفرەزەی تایبەتییان ڕێك ئەخست و لەهەر ئاوایییەکەوە بۆ لێدانی دوژمن لە دواوە بەڕێ ئەکەوتن. لە لایەکی ترەوە بە تەقەمەنی و پێداویستییەکانی شەڕ کردن بە هانای پێشمەرگەوە ئەچوون و گوشاری

تەقەکردنی جاش‌و جەیشیان لەسەر کەم ئەکردنەوە. لەو دەمەش دا کە هێزەکانی ڕژێم لە پاشەکشێ‌دا بوون، ئەمان لەسەر ڕێگاوبانەکانی ڕۆیشتنەوەدا بۆسەیان بۆ ئەنانەوەو گورزی کاریگەریان لێ ئەوەشاندن. هەروەك ئاواییەکان ببوون بە شوراو سەنگەری چالاکییەکانی پێشمەرگەو شەڕی مان‌و نەمانی کوردو داگیرکەریان تیا بەڕێوە ئەچوون.

شەڕی ناودێ، بە ناچاری‌و دوور لە خواستەکانی پێشمەرگەو ڕێنماییەکانی شۆڕش، بەرۆکی تێکۆشەرانی ئەگرت‌و سەرانی بەعسیش لە ڕێگای هێزی سەربازییەوە هەڵمەتی لەناوبردنی ئاواییەکان‌و کوشتنی دانیشتوانەکەیان دەست پێ ئەکردو جەنگی گورەپانەکانی پێشمەرگەو سوپاکەیان ئەبردە ناوماڵەکانی کوردەوە. ئەمەش لەکاتێك دا بوو کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە ڕووی ژمارەو چەکەوە لە زیاتر بوون‌و فراوانترا ئەبوون‌و چیتر نەدەکرا بەو قەبارەو سەنگو پێکهاتەیەوە لە شوێن‌و حەشارگە بچووکەکان دا بمێننەوە. بە تایبەتی لە زەوییەکی کراوەدا کە مەوداکانی بینین‌و ئامێرەکانی جەنگو هاتووچۆکردن تیایان دا لە بەرژەوەندی پارتیزانەکان دا نەبێت. بۆیە بڕیاردانی بەرۆژ مانەوەو جێنەهێشتنی ئاواییەکان، یەکێك بووە لە پێویستییەکانی ئەو قۆناغەو لەسەروەختی پەلاماردانی هەر ئاواییەك دا ئەبوو پێشمەرگەکان بێ دەنگییان لێ بکردایە هەتا ئەو کاتەی تەواو نزیك ئەبوونەوە، ئەو دەم ئەیاندانە بەر ئاربیجی‌و دەست ڕێژی جۆراوجۆری چەکەکانیان. سەرەنجام شەڕی ناودێ بە قازانجی پێشمەرگەو بەزیانی دوژمن کۆتایی پێ دەهات، چوونکە:-

ا/ هێزی ئاسمانی کە پێکهاتبوون لە (کۆپتەرو پیلاتۆن).

- دەست ڕێژو بۆردومانی کوێرانەیان ئەکرد، بەڵام نیشانەکانیان وەکوو پێویست لەیەك جیا نەئەکردەوە.

- جوڵەو مانۆرەکانیان چەند خولەکێکیان دەویست هەتا بۆ لێدانی نیشانەیەکی نوێ خۆیان ئامادە ئەکرد.

- لە مەترسی هاتنی پێشمەرگەی ناوچەکانی دەوروپشت دا، شەڕەکەیان بەجێ دەهێشت.

- ئەوەندە لە توانای فڕین‌و مانەوەدا نەبوون، هەتا بەرگری لە پەلاماردانی هێزە میکانیکی‌و پیادەکانیان بکەن.

- له كەشى باران بارينو تەم دا، زاڵتــى ئـەوەيان نـەبوو، نزيـك يـان لـە دوورەوە خۆيـان لـە قەرەى شەرەكان بدەن.

ب/ هێزى ميكانيكى كە پێكهاتبوون لە (مدرعەو تانك).

- تەنها لە هێڵى دواوە بەرگرىيان ئەكرد، قورسايى شـەرەكانيان بـە هـێزى پيـادە بـەرێوە ئەبرد.

- لە زۆريەى جاردا رۆڵيان نەبوو، چونكە ئاواييەكان ئەكەوتنە نـاو دۆڵو شـاخى سـەختەوە كە هيچ كەوانەيەكى ئاگريان نەبێت.

- لە رێشــتنو جێگاگۆركـێدا لاواز بـوون، دەرفـەتيان بـە پـارتيزان ئـەدا لـە گواسـتنەوەدا تێكيان بشكێنن.

- هێزى بە هاناوەچووى پێشمەرگە، زۆر بە ئاسانىو لە پشتەوە هەڵيان ئەكوتايە سەريانو بە خۆراكى گوللەيەك ئاربيجى ئەبوون.

ب/ هێزى تۆپخانە كە پێكهاتبوون لە ﴿هاوەنى (٨٢)ملمو هاوەنى (٦٠ملم)﴾.

- لەرويەرێكى ديـارىكراودا تـۆپ بارانيـان ئـەكرد، بـە پێچەوانەشـەوە بـەر چـەكدارەكانيان نەكەوتو كوژراوو بريندارىان لىٚ نەكەوتەوە.

- بەوردى ئامانجەكانيان نەئەپێكا، خەڵكى ئاوايىو پێشمەرگەيان ناچارى خۆشـاردنەوە لـە تۆپ بارانەكان نەئەكرد.

- پەكى هاتووچۆى پێشمەرگەيان نەئەخست، كە ئەيانويسـت لـە شـەرى خـانوو بـەخانوودا شوێنو جێگاكانيان بگۆرن.

ب/ هێزى پيادە كە پێكهاتبوون لە (قوات خاصـە، مغاوير، جيشى شعبى، جاش، مەنزومە).

- هەردواى ئەوەى چوار دەورى ئاواييەكانيان ئـەگرت، لـە تەقـەو پـەلاماردان دا فـرە بڕيـار بوون، بىٚ ئاگادارى لايەكەى تر شوێنەكانيان چۆڵ ئەكرد.

- لەســەر زەويـيـەكى كـراوەدا، پاڵپشـتى شـەركردنيان نـەبوو. لـە بەرامبــەر پێشـمەرگەى دامەزراوو لە بن ديوارو ديـنگەو پاڵ پەنجەرەى خانووەكان.

- هێرشى جياجياو بە پەلەيان ئەكردە سەر ماڵەكان، بۆ ئەوەى بە خێرايى شـەرەكە دوايـى پىٚ بێو فرياى پاشەكشىٚ بكەون.

**ب/ هێزی پارتیزان کە پێکهاتبوون لە (کەرتێکی پێشمەرگە).**

نهێنی سەرکەوتنەکانیان بریتی بوون لە:-

- هەژموونی زاڵی بیروباوەڕ لەسەر سوپایەکی هێرش هێنەر کە داگیرکەری شکۆمەندیو بەهاکانی نەتەوەو نیشتمانی کورد بووە.
- پەیڕەوکردنی تاکتیکو هونەری پارتیزانی ڕوبەڕوبوونەوە. لە کاتێك دا دوژمن پەلاماردەرەو ئەم داکۆکیکەرەو پنتی لاوازییەکان ئەقۆزێتەوە.
- پەرۆشیو هاریکاری بێ وێنەی ئاواییەکان کە خەڵکێکی یارمەتیدەرو پێشمەرگە بوون لە کاتی شەڕدا.

بەلام دامو دەزگاکانی بەعسو ناوەندەکانی شۆڕشی چەواشە لە نرخو پایەی ئەو سەرکەوتنانەیان کەم ئەکردەوەو تۆباڵی بەرودوای شەڕەکەو هەڵگیرساندنیان ئەخستە سەر هەڤالانی پێشمەرگەو خۆیان لە پرانسیپەکانی جەنگی پارتیزانی گێل ئەکرد کە پارتیزان بەو توانا کەمەی تەنها بەدەستو شان هەڵیدەگرێ، نایەوێ شەڕێکی بەرامبەریو چەند کاتژمێریی بەڕێوەبەرێت، لە کاتێك دا هێزەکانی دوژمن لەوپەڕی ئامادەباشیدا بن. بەڵکوو پارتیزان خۆی بڕیاری شەڕکردن یان نەکردنی ئەداتو کەشو کاتو هەلومەرجی تایبەتی لەبەر چاو ئەگرێو نەخشەو پلانی شەڕی براوەی پێیە.

## ٣/ لە ڕووی ئیدارییەوە.

هەڵبەت کاروباری لۆجستیکی پایەیەکی سەرەکی لە بناغەکانی سەرکەوتنو لە مەرجەکانی شۆڕشی چەکداری پێکدەهێنێ. سەرانی بزووتنەوەکەش ستراتیژی پەیوەندی خۆیان لەسەر بنەماو پەیڕەوە باوەکەی (دوژمنی دوژمنەکەم دۆستمە) بنیات دەنێن. لەو ڕووەشەوە لە توانا عەسکەرییو داراییەکانیان بەهرەمەند دەبنو سەرزەمینی ئەو وڵاتەش دەکەن بە بارەگاو شوێنی ڕاهێنانیانو ڕۆیشتنو هاتنەوەی تێکۆشەرو چارەسەرکردنی بریندارەکان. هەروەك جەنگاوەرەکانیان لە پێویستی خواردنو جلوبەرگو هاتووچۆدا پشتیوانی لیٚ دەکرێنو خێزانەکانیان لە شوێنی دیاری کراوداو دور لە ناوچەکانی شەڕو پێکادان نیشتەجێ دەکرێن.

بەلام لە شۆڕشی نوێدا ئەو شێوازەو جۆری ستراتیژەی دۆستو هاوپەیمانییە لە ئارادا نەبووەو بەو پێیەش ئەو وڵاتانەی کە هەریەکەو لە داگیرکەران دا بەشێکی تازەو دێرینیان

له کوردستان بەرکەوتبوو، بەردەوام لە ئیمزلکردنی ڕێکەوتنامە ئەمنی‌و سەربازی‌یەکان دا یەکدەنگی‌و هاوهەڵوێستی‌یان دەربەبڕی‌و کێشەی باشووریان بە هی خۆیان‌و لەسەر ئایندەی دەوڵەتەکانیان بە هەڕەشە ئەزانی. بۆ ئەم مەبەستەیش سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئەوەندەی بۆ ئیدارەدانی شۆڕش‌و هێزەکانی پێشمەرگە، پشت‌و پەنای بە تواناکانی گوندو بە جەماوەرەکەی بەستبوو، نیوو هێندە لە خەبات دا ئومێدی بە پشتیوانی‌و بە کۆمەکە داراییەکانی ئەو وڵاتانەی دەوروبەرلووسێ هەڵنەچنی بوو. یان سەرکردایەتی‌یەکەی بباتە ناو دەوڵەتێکی خانەخوێوەو لەوێشەوە هێزەکانی بۆ چالاکی‌و شەڕی ڕزگارکردنی کوردستان بنێرێتەوە.

پێشمەرگەی پارتیزان، ماڵی دووەم‌و خێزانەکەی لە نێو ئاوایییەکان دا دەبینی‌یەوە. هەر لەو پێناوەش دا تەمەن‌و ژیانی خۆی بۆ نەتەوەو نیشتمانەکەی دەبەخشی‌و ئەوەیش لە توانای خەڵکی ئاواییەکان دا بوایە لە خزمەت کردنی‌و حەواندنەوەی‌و جلوبەرگ بۆ شۆردنی‌و پێدانی نوێن‌و قات‌و پشتێن‌و پێڵاوو کراس‌و کڵاوو جامانەو ڕێز لێنانی، کەمتەرخەمی‌یان نەئەکرد. جوتیارانی گوند، دیوەخانی ماڵەکانیان کرد بوون بە میوانخانە بۆ پێشوازی‌و لە خۆگرتنی هەڤاڵانی پێشمەرگەو شوێنی سازدانی کۆڕو سیمینارو کۆبوونەوەکردن‌وحەرەسیات گرتن‌و دالدەدانی کەس‌و کارو ژن‌و منداڵی پێشمەرگەو چارەسەرکردنی نەخۆش‌و برینداره‌کانی شەڕ لە ناو ماڵەکانیان دا. هەروەها لە زستان‌و وەرزی هاوین دا بەر داڵان‌و ژوورو ناو حەوشەو سەربانی مزگەوتەکان ئەبوون بەو شوێنانەی پێشمەرگە کە تیای‌دا لە پێش‌و پاش ژەمی نان خواردن ڕوویان لێ ئەکردو ماوەی حەسانەوەو پشوودانی خۆیان تیا بەسەر ئەبرد.

کەم ئاوایی هەبووە. هاتووچۆی پێشمەرگەیان بەسەرەوە نەبێت‌و ڕۆژانەش خەڵکەکەی بە ئەرکی ئامادەکردن‌و لێنانی چێشت‌و چاو پێخۆری قاوەڵتی‌و نیوەڕۆژەو ئێوارەوە هەڵنەسێت‌و خۆراکی ژەمێکی سەریار بۆ میوان‌و پێشمەرگەی ڕێبوار نەپێچێتەوە. بە تایبەتی ئەو ئاواییانەی کە کەوتبوونە سەر ڕێگاکانی ڕۆیشتن‌و هاتنەوە، زیاتر لە چوار ژەمی نان خواردنیان بە هێزەکانی پێشمەرگە ئەداو بە درێژایی شەویش لە دەرگادان‌و سفرە حازرکردن‌و نان خواردن لە ماڵانی گوندنشینەکان دا چەند بارە ئەبوونەوە. سەردەمێکی

ولش به دروست کردنی نان ساجیو کولێرەو نان بەڕۆنو ناردنی پەنیرو ماستو میوە، بە شێوەی کاروانو کۆڵو باری ئێستر لە ئاوایییەکانەوەو گەیاندنیان بە بەرزترین لوتکەی چیاکانو لەوێشەوە دابەش کردنیان بەسەر سەنگەرەکان دا، ئەوپەڕی پشتیوانیو ماندوو نەناسی خەڵکی ئاوایییەکانی دەردەخست کە تێکەڵاو بە سەرکەوتنەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان ئەبوون.

چەندین پێداویستی ئەو ڕۆژگارە، هەر لەپەیداکردنی (برنەو، پەڕەشووت، کلاشینکۆف، سەمینۆف، ئارپیکەی، ژ/٣، ڕەشاش ژ/٢، بیکەیسی، ئارپیجی، دۆشکە، مین، قاڵبی تی ئێن تی، نارنجۆکو گوللەی جۆراوجۆری چەکەکان) بۆ کرینی ئامرازو کەلوپەلە سەربازییەکان، لە (مەخزەنوتاخمو شریتو نیتاقو زەمزەمیو شایلەو کوڵەپشتو لاقی تفەنگو قومباصو دووربینو دەزگای بێ تەل)، هەتا دەستەبەرکردنی(ئازوقەو سووتەمەنیو دلودەرمانو کەرەستەی چاپ)و کرینو گواستنەوەیان بۆ بارەگاو شوێنو ناوچەی مەفرەزە سەرەتاییو مەڵبەندو تیپەکان، بە تێکڕایی بۆ کۆششو تەقەلای خەڵکی ئاوایییەکان دەگەڕێتەوە. لە کاتێك دا ئەم پێداویستییانەش یان ئەوەتا لەسەر سنورەکان لە دەست بازرگانەکانی جەنگو سەودلکەرانی بە چنگ هاتوون، یان ئەوەتا بەهۆی سەربازی کوردو چەکدارەکانی ڕژێمو جاشەوە بەدەست هاتوون، کە ئەمەی دواییان بە نهێنیو ژێراو ژێر چەکو تفاقو تەقەمەنی عەسکەرییان بە خەڵکێکی (قاچاغ چی) دەفرۆشتو لە پاشان بەردەستی (ه.پ.ك) ئەکەوتن.

بێجگە لە ئەمبارکردنی تەقەمەنیو پێداویستییە بەدەگەکانی پێشمەرگە لە ئاوایییەکان دا، هیچ حەشارگەیەکی ئەوتۆ کاری پێ نەکراوە، کە هەم بتوانێ ڕێژەیەکی باش لە نهێنیو ئاشکرا نەبوونی بپارێزێو دووربێت لە خراپ بوونو باری کەشو هەوای تەڕو ووشییەوە، هەمیش لە تواناداا بولیە لە کاتی پێویست دا حەشارگەکە هەڵبدرێتەوەو فریای شەڕکردنو چالاکییەکانی پێشمەرگە بکەوتبایە. چونکە لە بناغەدا بۆ یەکێکی پارتیزان تەدەکرا لەسەروی تواناکانی خۆیەوە ئەو پێداویستییانە هەڵبگرێو ئاوایی بە ئاوایی جەولەیان پێ بکات کە لە بنچینەدا پێویستی پێیان نەبووە. بۆیە هەر لە نێوان چەند ئاوایییەك دا، ماڵی

یەکێك لە جوتیارەکان ئەبوو بە حەشارگەیەکی نهێنی بۆ شاردنەوەی ئەو پێداویستییانەی پێشمەرگەو چاودێرییو پارلستنی کەوتبووە سەرشانی خەڵکێکی متمانە پێکراوی گوندەکەوە.

هەر لە ناوانیەکان دا، (ئۆتۆمبیلو تراکتۆر) تاکە هۆی گواستنەوەی پێشمەرگەو پێداویستییەکانیان بوون. کە بەبێ پشتیوانی گوندنشینەکان ئەستەم بوو هاتووچۆی پێشمەرگە لە ناوانیەکەوە بۆ ناوانیەکی ترو لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر بەڕێوە بچێت، یان لە کورترین ماوەدا هێرشو پەلاماردان بۆ سەر ڕەبایەو پێگەی دوژمنەکانیان دەست پێ بکەنو ئەوساکەیش بە هێزێکی ماندوو بووەوە گۆڕەپانی شەڕەکە بۆ قووڵایی دورترین خاڵ بەجێ بهێڵن کە تیایدا بحەسێنەوە. هەر لەو پێناوەش دا چەندین قوربانیو زەرەرو زیان لە سەرو ماڵی گوندنشینەکان کەوتووە. بە سەدان ئۆتۆمبیلو تراکتۆر بەر شاڵاوی کۆپتەرو سوپاکەی بەعس کەوتوونو سوتێنراون. بە دەیان کەسیش لە شۆفێرەکانیان دەستگیرکراونو لە پاش ئازارو ئەشکەنجەدانیان گوللەباران کراون. بەو پێیەش ناوانیەکان:—

— شوێنی حەسانەوەو خۆڕێکخستنەوەو دڵدەدانی کەسو کارو خێزانەکانی پێشمەرگە بوون.

— لەوەختو ناوەخت دا، سفرەیەکی حازر بەدەست بوون بۆ ژەمێکی نان خواردنی بە پەلە.

— دەستەبەری پێداویستیو کەلوپەلە سەربازییەکانی پێشمەرگە بوون.

— جێی ئەمبارکردنی چەکو تفاقو تەقەمەنی بوون بۆ گۆڕەپانەکانی شەڕ.

— هۆیەکی گواستنەوە بوون بۆ خێراترکردنی جمووجۆڵیو چالاکییەکانی پێشمەرگە.

لە دوای پرۆسەکانی (ئەنفال)دا، ئەو بۆشاییە (لۆجستکیو ئیداری)یەی گوندنشینەکان دەرکەوت. دەرکەوت کە ناوانیەکان چەند لە توانایان دا هەبووە ژیانو زیندوێتی بە تێکۆشەران ببەخشنو چالاکییەکانیان درێژە پێ بدەن. شۆڕشی شاخ چەند بێ دڵنیشتوانەکەی لەگشت ڕاتیارییو پێویستییەکی ڕێکخراوەییو پێشمەرگەیی دابڕێنو لە ڕاست ئەو هەموو سیاسەتو نەخشەو پیلانە نوێیانە بێئاگا ئەبێت کە ڕژێمی سەرکار

ئەیهۆنینەوە. پێشمەرگەی پارتیزان چەند تواناکانی سنوردار ئەبن‌و ناتوانن کۆت‌و پێوەندەکانی ببەزێنن. گەلی کوردستان چۆن بۆ خەبات‌و شۆڕش لە تواناکان دا نابێت بوونی خۆیان بسەلمێنن. دەرکەوت کە (ماسی‌و ئاوەکە) چەند پێویستی‌یان بە یەکتری هەیە.

* * *

## بەشی شەشەم

# لە/ شەڕی پارتیزانی بچووکو سەرەتاییەوە بۆ/ شەڕی پارتیزانی گەورەو فراوان.

((دووەمین قۆناغی شۆڕش))

لەگەڵ درێژبوونەوەی کەوانەکانی شەڕی عێراق- ئێران دا، قەبەیی سوپاکەی بەعسی ساڵ بەساڵ هەڵدەلووشیو پەیتا پەیتا یەکە سەربازییەکانی لە کوردستان جوڵە پێ ئەکردو ڕەوانەی بەرەکانی شەڕی ئەکردن. لەسەر زەمینی کوردستان دا جۆرێك لە ناوچەی ڕزگارکراو بۆ شۆڕشو جەماوەرەکەی دەستەبەر ئەکردو کۆمەڵانی خەڵکیش پاساوی هەرەگرنگیان لە دەست دانە چەکو خەبات کردن دا بۆ هێنا بوونە گۆڕێو ئاواتەکانیان لەسەر مەرگی بە پەلەی کۆتایی ڕژێمو دەسەڵاتەکەی هەڵچنی بوو. ژمارەی پێشمەرگەش بە ئەندازەی دوو لەسەر چواری ڕێژەی جاران نەشو نمای کردبوو. کە چالاکییەکانیان لە چاو ئەو ئەژمارەیەی ڕابردوودا لەسەری دابەش ببوون، پێویستییان بە قەبارەیەکی زۆرتر لە پێکهاتەکەیانی دەکرد. هەر بۆیە نەدەکرا ئەو پێکهاتە بچووکانە وابمێننەوەو شێوازەکانیان دەست کاری نەکرێن. کە سەرئەنجام (کەرتو تیپو مەڵبەندەکان) جێگەی پێکهاتەکانی (مەفرەزەو کەرتو هەرێمەکان)یان گرتەوەو ئەرکەکانیان ڕێو شوێنی تازەیان گرتەبەر.

مەڵبەند، دامو دەزگایەکی سیاسیوعەسکەریو ئیداری بوو، کە هەموو چالاکییەکانی لە سنوری جوگرافیاکەیدا سەرپەرستی ئەکردو کاروباری ڕێکخستنو پێشمەرگایەتیو بەڕێوەبردنی ئاراستە دەکرد. بەو پێیەش کوردستان بەسەر (٤) مەڵبەندی پێشمەرگایەتی دابەش کراو هەر یەکێکیان لەسەر بنەمای شارێکی گەورەو ناوچەکانی دەوروپشتی جیا کرابوونەوەو هەر لێپرسراوێکی مەڵبەندیش ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو. لە ڕووی ژمارەیشەوە، بێجگە لە پێکهاتەی مەڵبەندی (٤)ی بادینان کە کەمترین ژمارەی پێشمەرگەیان لەخۆ گرتبوو، بەڵام ئەوسوای مەڵبەندەکانی (١)و (٢)و (٣) لە نێوان (١٢) تا (١٤) تیپی پێشمەرگایەتییان پێك دەهێنا. بە کردەوەش چارەسەری هەموو کێشە کۆمەڵایەتییەکانی گوندنشینەکانیان دەکردو دادگای یاساییان بۆ سزادانو لێپێچینەوە لە تاوانبارانی گەل دانا بوو.

تیپ لە چوار کەرتی پێشمەرگایەتی پێك هاتبوو. سنوری چالاکییەکانی لە نێوان (٣) تا (٦) ناوچە بەڕێوە دەچوون. لە شەڕێکی پێشمەرگانەی گەورەدا پاش ئەوەی کەرتەکان لە شوێنێکی دیاری کراودا کۆئەبوونەوەو چالاکییەکی هاوبەشیان ئەنجام ئەدا، دەسبەجێ گۆڕەپانی شەڕەکەیان بەجێ دەهێشتو دەگەڕانەوە بۆ ناوچەو سنوری چالاکییەکانی

پێشوویان. تیپ سەرپەرشتیاریی‌و بەگەڕخستن‌و هان دان‌و گورج‌و گۆڵتر کردنی چالاکی کەرتەکانی پێشمەرگەیان لە ئەستۆدا بوو. شان بەشانی دەستەبەرکردنی دلرایی‌و چەك‌و ئامرازو تەقەمەنی‌و پێداویستی‌یەکانی شەڕکردن‌و دانان‌و گۆڕین‌و لابردنی لێپرسراوی کەرتەکان، پاش وەرگرتنی ڕەزامەندی مەڵبەند.

کەرت ئۆرگانی بچووکترین پێکهاتەی شەڕ بوو، کە ژمارەکەی لە نێوان (٤٠) تا (٥٠) پێشمەرگە تێپەڕیان نەئەکردو لە (٤) مەفرەزەی هاوبەش دا ڕێك خرابوون. ئەبوو لە کاتی جەولەکردن‌و دانانی نەخشەو بەرنامەی شەڕکردن دا هاوشانی یەکتری کاریان بکردبایەو یەك تواناو گوڕزی سەربازی‌یان دروست بکردبایە. کەرت چالاکی‌یەکانی خۆی لە ناوچەو سنوری دەسەڵاتەکەی‌دا جێبەجێ دەکردو لە پاشان بۆ ئەنجام دانی چالاکی‌یەکی گەورە، بانگهێشتی کەرتێکی هاوسنوری دەکردو بە هاوبەشی پرۆسەکەیان بەڕێوە دەبرد، لێپرسراوی کەرت بەرپرسیار بوو لە دانان‌و گۆڕین‌و لابردنی فەرماندەی مەفرەزە دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی تیپ.

ئیتر هێزەکانی پێشمەرگە، گۆڕانکاری گەورەو بەرچاویان بە خۆیانەوە بینی‌و لە قۆناغی خۆشاردنەوەو بزرکردنی هەواڵ‌و دەنگوباسی لێرەو لەوێیان دا، بە ڕۆژی ڕوناك لەناو گوندەکان‌و نزیك لە شارو شارۆچکەکان، پشووی ئاسایی خۆیان وەردەگرت‌و لە ئامادەباشی‌دا بوون بۆ داکۆکی کردن‌و بەرپەرچ دانەوەی هەر پەلاماردانێکی دوژمن کە لە وەخت‌و ناوەخت دا بۆ سەر ناوچەکە دەستی پێ بکردبایە. سوپاکەی بەعسیش لە قۆناغی هێرش بردن‌و ڕاوەدونان‌و کێومال کردنی هێزەکانی پێشمەرگەدا بۆ قۆناغی بەرگری ساردو جێنەهێشتنی سەربازگەکان، نەخشەو بەرنامەکانیان گۆڕی. فەرمانیان بۆ ڕەبایەو یەکە سەربازی‌یەکانیان دەرکرد کە لە مەودوا دەوری مۆڵگاکانیان بە تەلی دڕکاوی تەلبەند بکەن‌و خاکەکەیشی بە مینی جۆراوجۆر بچێنن. ڕۆژانەش کۆپتەر بە ئاسمانەوە بفڕێن‌و ناوچەکان بخەنە ژێر چاودێری وردەوە. لە کاتی پێویست دا پیلاتۆزو سیخۆی ئامانجە دەست نیشان کراوەکان بۆردومان بکەن.

شەڕی پێشمەرگانەی نوێ، ساڵی (١٩٨٢) بەدواوە دەستی پێکردو لە نەبەردی‌یەکان دا پێشمەرگەی خاوەن وەرەو باوەڕ چۆکیان بە سوپایەکی دڕندەی دانەداو پەندو داستانی کەم

هاوتایان لە گۆڕەپانەکانی شەڕدا تۆمار دەکرد. لە دەسکەوتی چالاکی‌یەکانیان دا زۆرترین ژمارەی چەک‌و تفاق‌و تەقەمەنی‌یان چنگ ئەکەوت‌و پێداویستی‌یەکانی شەڕی پارتیزانی سەردەمەکەیان پێ پڕ دەکردەوە. دواتر لە توانای هێزی پێشمەرگەی کوردستان بوو، شەڕی فراوان‌و بەرەیی ئەنجام بدەن‌و ماوەی زیاتر لە (٣) مانگو نیو، ڕێگا لە هێرش‌و پەلاماردانەکانی لەشکری داگیرکەر بگرن. ساڵی (١٩٨٥- ١٩٨٨)یش تیپەکانی (هـ.پ.ك) بوون بە خاوەنی چەکەکانی وەك (هاوەنی ٨٢ملم‌و هاوەنی ١٢٠ملم‌و کاتیۆشاو ئێس پی جی ناین‌و ١٠٦و ستریلا)و لەیەك کات دا جەنگی پارتیزانی‌و بەرەییان تێکەڵاو ئەکرد. ئەو چالاکی‌یانەش بریتی بوون لە:-



## ١/ شەڕی ناودێ.

شوێن‌و کات. ← ڕووبەری ئاواییەك ← سەروەختی پشوودانی پێشمەرگە.

دەسپێکی پەلاماردان. ←دەمەو بەیانی← لە نیوەی ناوەڕاستی ڕۆژدا.

مەبەست لە ئەنجام دانی هێرشەکە. ←بەیەکەوە لەناوبردنی دانیشتوانی گوندنشینەکان‌و پێشمەرگە.

شێوەی گواستنەوەی هێز. ←بە ئۆتۆمبیل‌و ئیفاو زیل ←بە کۆپتەری بارهەڵگر.

نەخشەو شێوازی شەڕکردن. ←گەمارۆدان ←تۆپ باران کردن ←هێرش بردن ←پاشەکشێ کردن.

لەشکری پیادەی دوژمن. ←قوات خاصە ←مغاویر ←جاش ←مەنزومە.

هێزی ئاسمانی. ←کۆپتەر ←پیلاتۆز.

هێرشی میکانیکی. ←بە تانك ←بە مدرعە.

تۆپی گۆڕەپان. ←هاوەنی (٦٠)ملم ←هاوەنی (٨٢)ملم.

پێشمەرگەی بەشداربوو. ←لەنێوان (٤٠) تا ← (٥٠) پێشمەرگەی پارتیزان.

هەڵوێستی پارتیزان لە شەڕەکەدا. ←بەرگریکردن ←تێکشکاندنی دوژمن.

چۆنیەتی ئیدارەدانی شەڕەکە. ←بەسەرکردنەوەی هەڤاڵان ←شوێنو جێگا پێگۆڕکێ ←بردنو دابەش کردنی تەقەمەنی.

چەکی بەرەنگاربوونەوە. ←ژ/٣ ←کلاشینکۆف ←بیکەی سی ←ئار بیجی.

شەڕکردن لە پەنای. ←بن دیوارو دنگە ←پەنجەرەی خانووەکان ←لە سەربانو پەرژینی ناو حەوش.

سەرچاوەی کۆمەك. ←خەڵکی ئاوایی ←هێزی پشتگیری ←پێشمەرگەی هاوسنور.

هۆیەکانی سەرکەوتن. ←بیروباوەڕی زاڵ ←هونەری پارتیزانیو شەڕکردن ←پشتو پەنای گوندنشینەکان.

دەسکەوتەکان. ←چەکی جۆراوجۆر بەپێی ←کوژراو ←دیل ←بریندارەکان.

زیانی گیانی دوژمن. ←بەجێهێشتنی کوژراو ←دیل ←بریندار لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا.

لە تۆڵەی زیانەکانیدا. ←تۆپ باران کردنی ئاواییەکانی دەوروپشت ←بۆردومان کردنی ڕانەمەڕو جوتیاری ناو کێڵگە.

قوربانی (پ م). ← شەهید ←بریندار ←کەم ئەندام بوون.

زیانەکانی گوندنشین. ←کاول بوونو ڕوخانی چەند خانوویەك ←شەهیدو بریندار بوون ←سوتانی خەلەو خەرمانو کەلوپەلی ناوماڵ.

جێ هێشتنی کاریگەری دەروونی. ← ڕق ئەستور بوونی کۆمەلانی خەڵك لە ڕژێمی فەرمان ڕەوای بەعس.

* * *

## ٢/ شەڕی ڕەبایەگرتن.

ئامانجەکەی. ←بۆ ڕامالێنی لەشکری داگیرکەر لە کوردستان دا.

پێگە سەربازیەکەی. ←لەسەر جادە گشتیەکان ←لە دەوروپشتی شارۆچکەکان.

بە پێی ژمارە. ← (٢)تا ← (٥) ڕەبایەی دوژمن.

جۆری پێکهاتەی دوژمن. ←سرێیەکی پیادە ←پۆلیس ←جاش.

کۆکردنەوەی زانیاری. ←لەسەر ژمارەی هێزەکە ←چەکو ئامرازی شەڕ کردنیان ← شوێنی چاندنی مین.

هۆی یارمەتیدەر. ←ڕێکخستن ←لە ڕێی شوان و گاوان ←شۆفێری هاتووچۆی ڕێگاوبان ←بەچاوو دوربین.

زەمینەی لەبار. ←کەشی باراناوی ←تەم ←لە تاریکی شەودا.

ڕێ پیشاندەر. ←خەڵکی ناوچەکە ←ڕێکخستن ←شارەزایی پێشمەرگە.

گەیشتن بە نیشانە. ←نیوەی لە ڕێگای ئۆتۆمبیل ←تراکتور ←ڕۆیشتن بە پیادە.

پێویستی داواکراو. ←دابەش کردنی تەقەمەنی ←دانانی نهێنی ←کاتژمێری سفر.

چۆنیەتی دابەش بوون. ←بەسەر دەستەی پاشەکشێ ←هێزی پاڵپشت ←دەستەی پەلاماردەر.

ژمارەی پارتیزان. ←کەرتێکی پەنجا پێشمەرگەیی، یان ←گەورەتر لە قەبارەی پێویستی چالاکیەکە.

چەکی بەکارهێنراو. ←ئاربیجی ←نارنجۆك ←کلاشینکۆف ←بیکەیسی.

کاتژمێری سفری چالاکیەکە. ←لە نێوان (١٠) تا ← (٢)ی شەو.

مەرجەکانی ڕوبەڕوبوونەوە. ←دەست وەشاندنی گورچك بڕ بە یەکەمین ئاربیجی ←درێژە نەدان بە شەڕ ←پاشەکشێ کردن.

ماوەی ڕوبەڕوبوونەوە. ←یەك چارەك ←نیو كاتژمێر ←كەمتر لە كاتژمێرێك.

لەو پێناوەدا. ←پێشكەش كردنی گیانی خۆشەویسترین لە ڕۆڵەكانی نەتەوە ←خوێن ڕژانی هاوسەنگەرانی تر لە گۆڕەپانی شەڕەكەدا.

لە پای شەڕەكەدا. ←بە دەست هێنانی چەكی جیاجیا ←تەقەمەنی ←هاوەن ←دۆشكە ←بەڵگەنامە.

خاڵی پاشەكشێ. ←گوندێكی دیاری كراو ←چەم و دارستان و شوێنێكی قامیشەلان ←یان جێگرەوەی.

لیستی زیانە مرۆییەكانی دوژمن. ←كوژراو ←بریندار ←دیل.

بەرپەرچی سوپایی. ←بەربوونە گیانی خەڵك ←جیانەكردنەوەی پێشمەرگە لە دانیشتوانی گوند نشین.

بە كۆپتەر. ←پەی كردنی ناوچەكە بەدوای پێشمەرگەدا ←تەقەكردنی كوێرانە لە خەڵك.

بە تۆپخانە. ←نیشانەگرتنەوە لە ناوەڕاستی گوندەكانی دەوروبەر ←سوتاندنی ڕەزو باخ و خەلەو خەرمان.

سەرەنجام. ←تیاچوونی سەروماڵی خەڵك ←گواستنەوەی خێزان بۆ دەرەوەی ئاواییەكان.

ڕەت كردنەوەی كوشتار. ←بە دەست دانە چەك ←فراوان كردنی ڕیزەكانی شۆڕش.

* * *

## ٣/ شەڕی قافڵەی عەسکەری.

ڕیشەی چالاکی‌یەکە. ⟵بریتی بوو لە سەلماندنی وزەو تواناکانی پێشمەرگە ⟵پەند دادان بە دوژمن لەکاتی هاتووچۆکردن دا.

شوێن‌و کەوانەکانی شەڕکردن. ⟵سەرجادە گشتی‌یەکان ⟵لە نێوان شارو شارۆچکەکان.

ئەرکە سەربازی‌یەکەی. ⟵پشکنینی ڕێگاویانەکان ⟵مۆڵەتی ئاسایی یەکەکان ⟵گۆڕینی لیواو فەوجەکان.

لە نێوان. ⟵ (٢٠) تا ⟵ (٥٠) زیل‌و ئیڤاو جێب قیادەو لاندگرۆزەر.

بە پاڵپشتی. ⟵ناقیلەی هەلگری سەرباز لە پێش‌و پاش قافڵەکەوە ⟵هەندێ جار، کۆپتەری بارهەڵگرو جەنگی.

وەرگرتنی وردەکاری. ⟵لەسەر کاتی تێپەڕبوون ⟵ئەندازەی هێزەکە ⟵ئامانجی هێزەکە.

لە لایەن. ⟵ڕێکخستن ⟵شۆفێری هاتووچۆی هێڵەکە ⟵سەرنجی چاوو دوربین.

کەشی هەڵبژاردە. ⟵هەورو هەلا ⟵تەم‌و باران ⟵بەفر بارین ⟵یان کەشی ئاسایی.

سەروەختی نانەوەی بۆسەکە. ⟵کاتژمێر (١٠)ی بەیانی، بۆ ⟵ (٢)ی پاش نیوەڕۆ.

شێوەی ناردنی هێز. ⟵بە هۆیەکی گواستنەوە هەتا نیوەی ڕێگا ⟵بە پیادەو وەرگرتنی مەودا لە ڕۆیشتن دا.

پەیڕەوی ڕێنماییەکان. ⟵سەرەتاتکێ نەکردن ⟵تەقە دانەمەزراندن ⟵گوێ گرتن لە ئاربیجی یەکەم.

پۆلێن کردنی مەفرەزەکان. ⟵بەسەر پێشەنگو ⟵ ناوەڕاستو⟵ کلکەی قافڵەکەدا.

گورز وەشاندن. ⟵بە بازووی کەرتێکی پارتیزان لە سنوری ناوچەیەکی تیپ دا ⟵یان (٢) کەرت.

دەست بەکار بوون. ⟵بە گەیشتنی سەرەتای پێشەنگی قافڵەکە ⟵بۆ بەردەم خاڵی یەکەمی نانەوەی بۆسەکە.

بە زەبری ئاگری. ←سوتێنەری ئارپیجی ←گرکانی بیکەیسی ←دەست ڕێژی کلاشینکۆف ←ڕەشاش ژ/٢.

پێویستییەکانی پرۆسەکە. ←بە خێرایی یەك لایی کردنەوەی پرۆسەکە ←کۆکردنەوەی دەسکەوتەکان ←بەجێ هێشتنی ناوچەی شەڕەکە.

لە ڕووی کاتەوە. ←بە نیو کاتژمێر ←سێ چارەك، چالاکییەکە ئەنجام دەدرێ.

نوقلانەی سەرکەوتن. ←بە گیانی شەهید ←ژمارەیەك بریندار ←کەم ئەندام، تۆماردەکرێ.

لە نەبەردییەکەدا، دەیان. ←سنووقی تەقەمەنی ←بەڵگەنامە ←چەکی جیاجیا دەست هێزەکانی پێشمەرگە ئەکەون.

چۆڵکردنی گۆڕەپانی شەڕەکە. ←بە پێچەوانەی یەکەم دابەش بوون ←مەفرەزە لە دوای مەفرەزە ←خۆلادان لە هێڵی ئاسۆ.

کۆبەندی تیاچوونی دوژمن. ←بە پێی ئاماری پێشمەرگە ←نەخۆشخانەکان ←گوندنشینەکان.

دوای یەك کاتژمێر. ←کۆپتەرو پیلاتۆز ←تۆڵەی کوژراوەکانیان لە خەڵکی ئاواییەکان ئەکردەوە.

بە تۆپخانەی دورهاوێژ. ←کوێرانە(گوندو ناوچەکانیان) بە خەستی تۆپ باران ئەکرد.

بۆ ڕۆژی دوایی. ←ئەکەوتنە لەشکرکێشی سوپایی ←گوند سوتاندن ←گرتنی لاوەکان و بێسەرو شوێن کردنیان.

سەرژمێری تاوانەکان. ←کوشتن ←کاولکردنی گوند ←بە تالان بردن ←کۆچ پێکردن.

بەرپەرچی ئازارەکان. ←بە گەشەکردنی زیاتری بەرەی تێکۆشەران ←گەورە بوونی سوپای ڕزگاریخوازی نەتەوە.



## ٤/ شەڕی ڕزگارکردنی شارۆچکە.

بیرۆکەی گەڵاڵەبوونی. ←بەهۆی داهێزرانی قەبەیی سوپاکەی ڕژێم لە کوردستان دا ←گەورەبوونی تواناکانی شۆڕش.

هەڵکەوتەی جوگرافیاکەی. ←سەختی ناوچە ←چڕی دارستان ←ڕەگەزی چیایی دەوروبەر.

هێزی سەربازی دوژمن. ← (١) لیوای پیادە ←کەتیبەیەکی تانك ←یەکەیەکی تۆپخانە.

دامو دەزگا سیخوڕییەکان. ←بەڕێوەبەرایەتی ئەمن ←بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس.

سەرەداوەکانی پرۆسەکە. ←مەرجی هەڵسەنگاندنی پێشوەخت ←بوونی زانیاری تێروتەسەل.

بەپێی. ←ڕاپۆرتەکانی ڕێکخستن ←دۆستانی شۆڕش لە ناو شارۆچکەکەدا.

دەرفەتی گونجاو. ←کەشێکی خراپ کە بینین تیایدا سنوردارە، یان ←کەڵك وەرگرتن لە تاریکایی شەو.

کۆکردنەوەی هێزەکان. ←بەهۆی دەزگای بێ تەل ←بروسکەی تایبەتی (جفرە) لە ڕادیۆوە ←بەنامەی دەستی.

لەسەر ئاستی. ←تیپەکانی مەڵبەندی یەك جوگرافیا، یان ←بە هاوبەشی مەڵبەندێکی هاوسنور، یان ←دور لە یەکترییەوە.

جووڵەو مانۆڕەکانی پێشمەرگە. ←جەولەکردن لە ناوچەکەدا ←نزیك بوونەوە ←پەلاماردان.

بە ڕەچاوکردنی. ←ڕێکردن بە پیادەو وەرگرتنی ماوە لە نێوان پێشمەرگەدا ←دورکەوتنەوە لە سواری ئۆتۆمبیلو تراکتۆر.

قایم کردنی ڕێگاوبانەکانی دەرەوە. ←بە نانەوەی بۆسەی جۆراوجۆر ←لێدانی دوژمن لە کاتی لەشکرکێشیدا.

ئەرك پێ سپاردنی تیپەكان. ←بەسەر شارەزاو نەشارەزا ←پاڵپشتو پەلامارد‌ەر.

بە چەكی سادەو قورس. ←ئارپیجی ←بیكەیسی ←كلاشینكۆف.

دەست نیشان كردنی وادەی هێرش. ←لە كاتژمێری (١٠) بۆ ← (١٢)ی شەو.

مەرجەكانی پارتیزان. ←دەسپێشخەری لە پەلاماردانی دوژمن ←بوار نەدان بەخۆ ڕێكخستنەوەی ←كۆنترۆڵ كردنی ئامانج.

لایەنی كەم و لایەنی زۆر. ← (٢) كاتژمێر، تا ← (٣) كاتژمێری شەڕی خوێناوی دەستەویەخە.

بەخوێنی ڕژاوی. ←ژمارەیەك شەهید ←چەندین بریندار، دوژمن لە شارۆچكەكە پاك ئەكرێتەوە.

دەست بەسەراگرتنی، دەیان. ←ئەمباری تەقەمەنی ←پارچە چەك ←ئازوقە ←ئۆتۆمبیل ←بەڵگەنامەو هیتر.

دوای پرۆسەكەش. ←گواستنەوەی دەستكەوتەكان بۆ دەرەوە ←چۆڵكردنی شارۆچكەكە ←سەنگەرگرتن لە شاخ.

لەبەركەوتوانی دوژمن. ←كوژراوی زۆر ←بریندارو پەككەوتە ←دیلی جیاجیا لە ئەمن و سەربازو پۆلیس.

لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا. ←هێرشی ئاسمانیو ←سوپایی بۆ سەر ناوچەكە دەستیان پێ دەكرد.

كۆپتەرو پیلاتۆز. ←بە خەستی شارۆچكەكەو ←گوندەكانی دەورویەریان بۆردومان ئەكرد.

فرۆكە جەنگیەكان. ←شارۆچكەكەو ←چەند ئاواییەكی سنورەكەیان كیمیاباران ئەكرد.

بە شێوەیەك ئاواییەكان. ←زیانی ترو ←قوربانی سەرو ماڵی تریان لێ ئەكەوت.

دانیشتوانەکەی. ←بیریان لە دروست کردنی خانوو ←شوێن‌و داڵدەی نوێ لە جێگای تر کردەوە.



## ٥/ شەڕی پاک کردنەوەی زنجیرە شاخ.

هۆی ستراتیژی. ←بۆ تەواوکردنی پرۆسەی ڕاماڵینی دوژمن لە پاش ڕزگارکردنی شارۆچکەکان ←بنبڕکردنی چاودێری دوژمن لەسەر ناوچەکە.

لە کردەوە سەربازی‌یەکانیان. ←تۆپ باران کردنی ئاوایی‌یەکان ←تەقەکردن لە ئۆتۆمبیل‌و تراکتۆری پێشمەرگە ←سوتاندنی بژێوی ژیانی خەڵکەکە.

دروست بوونی ڕای گشتی کۆمەڵانی خەڵك. ←لەسەر پەلاماردانیان ←هەڵکەندنیان لە لوتکەی شاخەکان ←پەند دادانیان.

جۆرو پێکهاتەی دوژمن. ←لە یەکەیەکی پیادەی عەسکەری ←لە سرێیەکی جاش مەنزومە ←لە فەوجێکی جاشی سووك.

پشت بەستن بە. ←زانیاری‌یەکانی ڕێکخستن ←هاووڵاتیانی مەدەنی ←خودی بە دواداچوونی پێشمەرگە.

پێزانینی. ←تولە ڕێگاکان ←شوێنی چاندنی مین ←بۆسە نانەوەی شەو ←ژمارەی دوژمن.

هەوڵدان بە. ←پەیوەندی کردن بە چەکدارە (عەرەب)و (کورد)ەکان ←ڕێکەوتن لەسەر نیشانەیەك بۆ خۆبەدەستەوەدان.

ماوەی ڕێکخستن‌و سازدانی هێزەکان. ← (٢) تا (٣) ڕۆژ ←بە بروسکەو دەزگای بێ تەل‌و نامەی دەستی.

بۆ چەواشەکردنی دوژمن. ←دورخستنەوەی هێزەکان لە کاتی ڕۆژدا ←کۆکردنەوەیان لەگەڵ تاریکی شەودا ←هەندێ جار بڵاوەپێکردنیان.

نزیك بوونەوە لە نیشانە. ←پێش کاتژمێری سفر ←دابەش بوون ←دامەزراندنی تەقەو پەلاماردانی کتووپڕ.

به چاوساغی کردن‌و پالپشتی. ←هه‌ڤالانی ڕێکخستن ←ئاوایییه‌کانی ده‌وروبه‌ر ←پشتگیریی ناوچه‌که.

هه‌لگرتنی پێداویستی یه‌ده‌گی. ←له ته‌قه‌مه‌نی ←ئاو ←یه‌ك تا دوو نان بۆ هه‌ر پێشمه‌رگه‌یه‌ك.

هێزی به‌شداربوو له پرۆسه‌که‌دا. ←له‌سه‌ر ئاستی مه‌لبه‌ند ←هێزی پشتگیری.

له‌گیان بازی‌یه‌کانی پێشمه‌رگه. ←دزه‌کردن بۆ مۆلگاکانی پشته‌وه ←کۆنترۆڵ کردنی باره‌گاکانی (قیاده)و ←لێدانی ته‌پڵی سه‌رکه‌وتن.

چه‌کی په‌لاماردان. ←ئاربی‌جی ←کلاشینکۆف ←ژ/٣ ←ئار بی که‌ی ←نارنجۆك.

چه‌کی پالپشت. ←بی‌که‌ی‌سی ←کاتیۆشا ←هاوه‌نی ٨٢ملم‌و ١٢٠ملم ←دۆشکه ←ستریللا.

ده‌سپێکی واده‌ی هه‌لمه‌ت. ←له نێوان کاتژمێری (١١) بۆ ← (١)ی شه‌و چالاکی‌یه‌که ئه‌نجام ده‌درێ.

ماوه‌ی ڕووبه‌ڕووبوونه‌وه. ← (١)تا ← (٢) کاتژمێر.

زیانی مرۆیی داگیرکه‌ر. ← (١٠) کوژراوو دیل ←له‌به‌رامبه‌ر (شه‌هیدو بریندار)ێکی پێشمه‌رگه‌ی پارتیزان ده‌شکێنه‌وه.

شان به‌شانی زیانی زۆری. ←ئه‌مباری ته‌قه‌مه‌نی ←جبه‌خانه‌ی چه‌کو ←پێداویستی عه‌سکه‌ری له هێزه‌کانی ده‌که‌وێ.

دوژمن کوێرانه به. ←تۆپخانه ←کۆپته‌ر ←پیلاتۆز، ئه‌که‌وێته بۆردومان کردنی ناوچه‌کانی ده‌وروبه‌ر.

به چه‌کی ژه‌هراوی کوشنده. ←ژن‌و منال‌و په‌ککه‌وته‌و به‌ساڵاچووی له ئاوایییه‌کان دا نوقمی کیمیاباران ئه‌کرد.

* * *

## ٦/ تۆپ باران کردنی مۆڵگاکانی دوژمن.

له پەرچەکرداری. ←بۆردومانی گوندنشینەکان.

یان، جێبەجێکردنی. ←چالاکی پێشمەرگەیی ←بێ دەنگ کردنی تۆپەکانی دوژمن.

پێگە سەربازییەکانیان. ←له دەوروبەری شارو شارۆچکەکان ←به تەنیشت لیواکان.

له کردەوەکانیان. ←تۆپ باران کردنی ئاوایییەکان ←بنکەو بارەگاکانی پێشمەرگە ←ڕێگاکانی ڕۆیشتن‌و هاتنەوە.

تۆپی بەکارهێنراو. ←نەمساوی ←هاوەنی (١٢٠) ملم ←هاوەنی (٨٢) ملم.

لەسەر دەستی. ←تۆپخانەی شۆڕش ←له تیپی تایبەتی مەڵبەند.

پێویستی داواکراو. ←بەکارهێنانی نەخشە ←قومباص ←شاخص ←خشتەی مەوداکان.

مەرجەکانی تۆپ باران. ←بوونی دەزگای بێ تەل ←دیدەوانی ←دوربین.

دۆزینەوەی نیشانە. ←بەیەك تا دوو گولله تۆپ، له پاشان ←تۆپ بارانی خەست.

له ڕووی کاتەوە. ←یەك چارەك ←نیوکاتژمێر.

دەسبەجێ پاشەکشێ. ←له شوێنی تۆپ بارانەکە. ←بۆ ناوچەیەکی دورە دەست.

زیانی دوژمن. ←کوژراو ←بریندار ←تەقینەوەی ئەمباری تەقەمەنی.

بەرپەرچی سوپایی. ←لەشکرکێشی ←تۆپ باران کردن ←کاول کردنی ئاوایییەکانی دەوروبەر.

زیانەکانی گوندنشین. ←تیاچوونی سەرومالّ ←ئاوارەبوون.

  

ئەمەو سـەرەڕای چەندین چالاکی پێشمەرگەیی تر لەنێو شارەکان دا بەڕێوە دەچوون. لەوەخت و ناوەخت دا گورزی کاریگەرو گەورەیان لە دام و دەزگاکانی بەعس ئەسرواندو لە نێو ئاپۆرەی خەڵك دا بە دەیان سیخوڕو پیاوی ئەلقە لەگوێ و تاوانباری گەلیان پێش خۆیان ئەداو لەبەردەم دادگاکانی شۆڕش دا بەر سزای ڕەوای کردەوەو ڕەفتارەکانیان ئەکەوتن. هەروەها لە توانایان دا بوو، لەگەڵ تاریکی شەودا کۆنترۆڵی زۆربەی شارو شارۆچکەکان بکەن و دەسەڵاتدارانی حزب و لایەنگرەکانی، ملکەچی هەڵهاتن و خۆبەدەستەوەدان بکەن. لە کاتێك دا ڕژێمی فەرمانڕەوا بە هێزێکی سەربازی و ئەمنی زەبەلاحی دەوڵەتەوە، نە لە توانای دا بووە لە ڕێی موخابەرات و مەنزومەو بەڕێوەبەرایەتی یەکانی ئەمن و ئیستیخباراتی عەسکەریەیەوە زانیاری چڕوپڕ لە وادەی هێرش و پەلاماردانەکانی پێشمەرگە کۆبکاتەوەو لایەنی کەم ناوەڕۆکی پرۆسەکان بەتاڵ بکاتەوە، نە بەسوپایەکی مۆدێرن و بە تەکنەلۆجیا عەسکەری یەکەی زاڵ بێت بەسەر گۆڕەپانەکانی شەڕداو ڕێگا لە جێبەجێکردنی چالاکی یەکانی پێشمەرگە بگرێت.

بەڵام بەعس بایەخی دابووە دروست کردن و بەرهەم هێنانی چەکی کیمیایی و لە هەڵپەی دابین کردن و پەرەپێدانی تۆخم و پێکهاتەی ژەهراوی یەکانی تـرا بوو. بە شێوەیەك دام و دەزگاکانی (تصنیع العسکری)و تاقیگە نهێنی و ئاشکراکانی بەو پەڕی توانا داراییەکانیەوە خستبوونەکارەوەو کەرەستەی خاوی ئەو گازە کوشندانەی بۆ دەستەبەر ئەکردن، لە کاتی تێشکانی هێزە ڕوخاوەکانی دا بە (تۆپ و کاتیۆشاو فڕۆکەی جەنگی)، بارەگاو سەنگەرەکانی پێشمەرگەیان ئەکوتاو لە پاشان چەند ئاواییەکیان بە ژەهری (خەردەل و سیانیدو ڤی ئێکس) بۆردومان ئەکرد. ئەو بەڵێنانەی خۆیان بەجێ ئەگەیاند کە ساڵی (١٩٨٤) لە بەغدا بە وەفدەکەی شۆڕشی کوردیان دابوو کە ئەگەر واز لە شۆڕش و خەبات نەهێنن ئەوا بە هەموو شێوازو جۆرێکی نائاسایی چەك لە بەرامبەریان دا ئەوەستنەوە.

لە دووەمین قۆناغی شۆڕشەکەدا، هێزەکانی پێشمەرگەی کوردستان هەر لەسەر بنەماکانی جەنگی پارتیزانی درێژەیان بە شۆڕشە چەکداری یەکەی گەلی کوردستان داو هەتا پێیان ئەکرا خۆیان لە قەرەی شەڕی نیزامی دور ئەخستەوە، کە سوپاکەی بەعس لە بەرنامەی دا بوو پێشمەرگەو سەرکردایەتی یەکەی بە شەڕێکی تاقەت پڕوکێن و بەرامبەری یەوە خەریك بکات، کە هەم بتوانێ پەلاماردانەکانی پێشمەرگە لە ناوچە جیاجیاکان دا لەسەر هێزەکانی کەم بکاتەوەو لە نێو سەنگەرەکان دا بەشەڕێکی دۆڕاوەوە

سەرقاڵیان بکات، هەمیش لە کاتی پێویست دا بە چەکی کیمیایی خنکێنەر ئەو هێزە زۆرانەی پێشمەرگە لەناوبەرێت و شەڕەکە بە قازانجی خۆی و بە زەرەرو زیانی شۆڕش کۆتایی پێ بهێنێ. بۆیە گواستنەوەی بنکەو بارەگاکانی شۆڕش لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی ترو دابەش کردنی سەرکردایەتی‌یەکەی بەسەر (٤) مەڵبەندی پێشمەرگایەتی‌دا، بۆ ئەوە بووە، تاوەکوو خۆی و هێزەکانی بە شەڕێکی واوە نەگلێنێ کە دوژمن تیایدا براوە دەبێت.



## ١/ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی ئاواییەکان.

یەکەمین وەرچەرخانی کولتوری بووە لە ژیانی گوندنشینەکان دا. کە یـەکێتی نیشـتمانی کوردستان ویستبێتی لە بازنەیەك دا هەموو پێکهاتەی چینو توێژەکـان کۆبکاتـەوەو لەسـەر ژیانی تایبەتی خۆیان بیروڕاکانیان پێ ئاڵوگۆڕ بکـات. فێریـان بکـات کـە دەکـرێ کۆمـەڵانی خەڵك بڕیار دەربنو کەسی شایستەو هەڵسووڕێنەر بۆ ئاواییەکانیان هەڵبژێرن. دابو نەریتی بنەماڵەو هۆز لە چاڵ بنێنو کوێخایەتی ڕەت بکرێتـەوە. بـەو پێیـەش داهێنـانێکی نـوێ لـە ئارادا بووە کە پاڵپشتە واتاییەکەی لە هێزێکی سیاسییەوە وەرگرتووەو لە توانایدا بووە.. بنەماکانی بچەسپێنێ. هەروەها بە کـردەوەش لـە ئاواییـەکان دا بۆشـاییەکی ڕێکخستنو ئیدارەدانی خەڵك بەڕۆکی دانیشتوانەکەیو هێزەکانی پێشمەرگەیان گرتبـوو، کـە نـەدەکرا لە پاڵ ئەو ئازادییە دەگمەنە، بەهایـەکی گەشـترو جوانـتر بـەگوندەکان نـەدرێ. تـاوەکوو پرۆسەی هەڵبژاردنی ئاواییەکانیان لێکەوتـەوە کـە هاوکـات بـوون لەگـەڵ گۆڕانکارییـەکانی شۆڕشو دامەزراندنی تیپو مەڵبەندەکان. ئەم هەڵبژاردنانەش بە شێوەیەکی ئاشکراو نهێنی لە ئاواییەکان دا بەڕێوە ئەچوون. کاروچالاکی ئەنجومەنی ئاواییەکان بریتی بوون لە:-

- ڕۆڵی ناوبژی کردن لە چارەسەری کێشەو ململانێی ناو گوندەکان.
- سازدانی کۆڕوکۆبوونەوە لە ئاواییەکان دا بۆ بڕیاردان لەسەر داواکارییەکانی خەڵك.
- یەك لایی کردنەوەی قەیرانەکان لەسـەر کێشـەی ئـاو، زەویوزار، دیـاری کردنـی سـنوری نێوان گوندەکان.
- ڕێکخستنی هەماهەنگیو پێکەوە کارکردن لە بوارەکانی دروێنەو ئاودانو جۆمـاڵ کـردنو گواستنەوەی بەرهەم دا.
- پێکهێنانی تیمـی فریـاگوزاری بـە پەلـە بـۆ ڕوداوە کتوپڕەکـانو ئاسـایی کردنـەوەی بارودۆخی شڵەژاوی گوندنشینەکان.
- کۆکردنەوەی پیتاك بۆ دروست کردنو بنیات نانی ئەستێڵی ئاو، پەرژین، ڕاکێشانی تۆڕی ئاو، چاك کردنەوەی کانیاوەکان.
- نوێ کردنەوەی ڕێگاوبانەکان بە چەوڕێژکردن، دامەزراندنی پـرد، دروسـت کردنـی دیـوارو کەڵەك، ئاوەڕۆ.
- دابەش کردنی میوانو پێشمەرگە بەسەر ماڵان داو دەستەبەرکردنی هۆیەکانی گواستنەوە لە ئاواییەکەوە بۆ ئاواییەکی تر.

- پشتگیری کردنی قوتابخانەکانی شۆڕش لە ناردنی منـاڵانی گوندنشـینەکان بـۆ خوێنـدن‌و پەیداکردنی پێداویستی‌یەکانیان.
- جەولـەکردن بـە هێزەکـانی پشـتگیری بـۆ پاراسـتنی هێمنـی‌و ئاسـایش‌و دەسـگیرکردنی پیاوانی شەوکوت‌و نامۆ لە سنوری ئاواییەکان دا.

پێشمەرگەی ناوچەکـەش پشـت‌و پـەنای ئەنجومـەنی ئاواییـەکان بـوون. لـە کـاتی گیرخواردنیان بە کێشەیەکەوە، دەستی هاوکاریان بۆ درێژ ئەکردن‌و چارەسەری گونجاویـان بۆ ئاستەنگەکانی بەردەمیان ئەدۆزینەوە. دیارە پرۆسەیەکی واش کە ئەزموونێکی تازە بـوو لەناو گوندەکان دا، ئاسایی بوو ڕوبەڕوی دەیان گیروگرفت‌و دژواری ببێتەوەو لـە ناوچـەکان دا وەکوو یەك شـێوازو فـۆرم سـەقامگیر نـەبن. کـە هـەندێکیان پـەیوەندی‌یان هـەبووە بـەو ئاواییانەی کە نزیك بـوون لـە شـارو شـارۆچکەکانەوەو دانیشتوانەکەیشـی بـەردەوام ترسـی ئەوەیان لێ نیشتبێت کە شەوانە ڕۆژ بەر پەلامارەدانەکانی جەیش‌و جاش بکـەون. بـەڵام لـە زۆربـەی ناوچـەکانی ژێـر دەسـەڵاتی پێشـمەرگەدا کـە جوگرافیاکانیـان سـەخت‌و لـە شارۆچکەکانەوە دور بـوون، هـەڵبژاردنی ئەنجومـەنی ئاواییـەکان سـەرکەوتنی گـەورەیان بەدەست دەهێناو خەڵکەکەی ئەیانتوانی بە دەستی خۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوەبەرن.

## ٢/ کردنەوەی قوتابخانەکانی شۆڕش.

ئەو ساڵەی گفتوگۆی نێوان شۆڕش‌و سەرانی بەعس کۆتایی پێ هات‌و ڕژێمەکەی عێراق کە هیچ ئامادەبوونێکی بۆ چارەسەرکردنی کێشە ڕەواکانی گـەلی کوردسـتان دەرنـەبڕی. لـە بڕیـارێکی چـاوەڕوان کـراودا هـەموو قوتابخانـە سـەرەتایی‌و ناوەندی‌یـەکانی لەسـنوری ئاواییەکان دا داخست‌و ناوچەکانیشی بە شوێنێکی سـەربازی‌و لـە دەرەوەی دەسـەڵاتەکانی دەوڵەتی ناوبردن. بەڵام شـۆڕش لـە تـاقی کردنەوەیـەك دا کـە نەیهێشـت منـاڵانی کـورد لـە خوێنـدەواری‌و لـە فـێربوونی وانـەکانی نـوێی ژیـان بـێ بـەش بـن، لێپرسـراوێتی ئەرکـە نیشـتمانی‌یەکەی بـە ڕێکخراوەکـەی (یـەکێتی مامۆسـتایانی کوردسـتان) ڕاسپاردو بـەڵێنی هاوکـاری‌و پێشـکەش کردنـی دارایـی‌و جێبـەجێ کردنـی پێداویسـتی‌یەکانیانی بـۆ دوپـات کردنەوە. هەروەها هەرچی لە توانای هێزەکانی پێشـمەرگەی کوردسـتان دا بـووە لـە دابـین کردنی خوێندنگاو کتێب‌و ئامرازەکانی خوێندن‌و هـاندانی منـاڵانی گوندنشـینەکان بۆچوونـە قوتابخانە، هیچ درێخی‌یەکیان لەو پێناوەدا نەئەکرد.

ئیتر ڕێکخراوی یەکێتی مامۆستایانی کوردستان کەوتنە خۆیان و لە جارانیش ماندوونەناسانەتر هەڵوێستی نەتەوایەتی خۆیان خستەڕوو. لە سەرەتادا پەیوەندییان کرد بەو مامۆستا نیشتمان پەروەرانەی کە ئامادە نەبوون خزمەتی سەربازی بۆ ڕژێمەکەی صدام بکەن لە سنووری ئاواییەکان دا نیشتەجێ ببوون. لە پاشان ژمارەیەکی تریان لە دەرچوانی خوێندنی ئامادەیی و ناوەندییەکان دەستەبەر کردو دوای هەڵسەنگاندن و تاقی کردنەوەی تواناکانیان، لە قوتابخانەکان دا دەست بەکار ئەبوون. لە دەرفەتی جیاجیاش دا یەکێتی مامۆستایانی کوردستان پرۆسەی هەڵبژاردنیان بۆ دیاری کردنی مامۆستایانی سەرپەرشتیارو هەڵسوڕێنەری قوتابخانەکان بەڕێوە دەبردو ئەمانیش ناوبەناو سەردانی ئاواییەکانیان دەکردو لەگەڵ دانیشتوانی گوندەکان کۆڕو کۆبوونەوەیان ڕێك ئەخست و لەبارەی کارئاسانی کردن بۆ مامۆستایانی شۆڕش و بەردەوام بوونی خوێندن لە قوتابخانەکان دا بیروڕایان ئاڵوگۆڕ ئەکردو لە کێشەکانیان ئەکۆڵییەوە.

هەموو بەیانیێکی زوو، منداڵانی گوندنشینەکان دەستەدەستە لە ناوەوەو دەرەوەی ئاواییەکان ڕێچکەیان دەبەست و بەرەو قوتابخانەکانی شۆڕش هەنگاویان هەڵدەگرت. بە لێدانی یەکەمین زەنگی وانەکانی خوێندن، لە گۆڕەپانی خوێندنگاکان دا ڕیز ڕیز ڕادەوەستان و بە سروودی (مەشخەڵانی شۆڕشی نوێ ئەم جارە) گوندەکانیان ئەهێنایە جۆش و خرۆش و دواتر بە پێشکەش کردنی ئامۆژگاری و چەند تێبینییەکی تازە لە لایەن مامۆستاکانیانەوە، بەسەر پۆلەکانی خوێندن دا دابەش دەبوون. مامۆستایانی دڵسۆز زۆر بە باشی و لەخۆ بوردووانە لە پەیامە پیرۆزەکەی خۆیان گەیشتبوون کە ئەرکی ئەوان فێرکردنی خوێندەواری و گۆش کردنی نەوەکانی نوێیە بە هەستی نیشتمان پەروەری و لابردنی تیزو ئایدیۆلۆژییەکانی بەعسیزمە لە بەرنامەکانی خوێندن دا.

میری، بەنیگەرانییەکی زۆرەوە، هەواڵی کردنەوەی قوتابخانەکانی شۆڕشی پێگەیشت و لەلایەن تۆڕی دام و دەزگا سیخوڕییەکانیەوە، دەستی کرد بە کۆکردنەوەی زانیاری لەسەر مامۆستاکان و لە چەند هەڵمەتێکی جیاجیای نێو شارەکان دا، ژمارەیەك لە کەس و کاری مامۆستایانیان دەسگیرکردو لە پاشان چەند خێزانێکی تریان دەربەدەری ئاواییەکان کرد. هەروەك لە کاتی بۆردومان کردنی ناوچەکان دا، دوژمن بە تۆپخانەو فڕۆکە جەنگییەکان، مەبەستیان بوو نیشانەی ورد لە قوتابخانەکان بگرنەوەو منداڵانی کورد لە ناو خوێنا

بگەوزێنن. داهێنانەکانی شۆڕش لەبارەڕن‌و نـەهێڵن کـوردەواری گەشـە بـە کۆمەڵگاکەیـەوە ببینێ.

## ٣/ پێکهێنانی هێزەکانی پشتگیری.

بیرۆکەی لە دایك بوونی ئەم هێزە، ژمارەیەك هۆی کۆمەڵایەتی‌و پێشمەرگەیی‌و ناوچـەیی لە پشت پێکهێنانیەوە گەڵاڵە بوون‌و لەو قۆناغەدا وەك پێداویسـتی‌یەکی مێژوویـی لـە ژیانی گوندنشینەکان دا چووە بواری جێبەجێکردنەوە. کە تیـایدا یـەکێتی نیشـتمانی کوردسـتان ئەو هەنگاوەی بە پێویست زانی‌و بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە داوای لە کۆمـەڵانی خـەڵکی کوردستان کرد کە خۆیان چەکدار بکەن‌و لایەنی کەم بـۆ ئـەوەی داکۆکـی لـە بـوون‌و ژیـان‌و سـەروماڵی خۆیـان لـە نـاو گوندەکـان دا بکـەن. لـەم بارەیەشـەوە لـە زۆربـەی ناوچــەکانی کوردستان دا بە گەرمی پێشوازی لەم داوایە کراو خەڵکەکەی بە پارەو پووڵی خۆیان چـەکی سـادەو قورسـیان کـڕی‌و هێزەکـانی پێشـمەرگەش بـوون بـە هـاندەرێك بـۆ سـەرکەوتنی پرۆسەکەو ئاوایییەکانیان لە مەفرەزەی جیاجیادا ڕێکخست‌و لە کاتی چۆڵکردنـی ناوچـەکان دا ئەمان شوێنی هێزەکانی پێشمەرگەیان ئەگرتـەوەو ئـاوایی بـە ئـاوایی جەولـەیان ئـەکرد. پوختەی چالاکی‌یەکانیان لەم تەوەرانەدا خۆیان دەبینی‌یەوە:-

- هەڵسان بە چالاکی پێشمەرگەیی لەسەر ڕێگاوبانەکانی ڕۆیشتن‌و هاتنەوەدا.
- جەولەکردن شان بەشانی پێشمەرگەو بەشداری کردن لە قۆڵەکانی شەڕەوە.
- ئەنجام دانی شەڕی ناودێ بە پشتیوانی هێزەکانی پێشمەرگە.
- چوون بە هانای پێشمەرگەوەو شکاندنی گەمارۆکانی دوژمن.
- گەیاندنی تەقەمەنی‌و پێداویستی‌یەکانی شەڕکردن بۆ سەنگەرەکانی پێشمەرگە.
- پێشڕەوی‌و چاوساغی کردن بۆ ئەنجام دانی شەڕی پێشمەرگانە.
- گواستنەوەی شەهیدو بریندارەکان بۆ نەخۆشخانەو لەوێشەوە بۆ لای کەس‌و کاریان.
- بۆسە نانەوە لەسەر جادە خۆڵەکان‌و ئێشکگرتن بە درێژایی شەو.
- دەرکردنی حەرەسیات بۆ پاراستنی ئارامی‌و ئاسایش لەناو گوندەکان دا.
- دەسگیرکردنی گومان لێکراوان‌و ناردنیان بۆ مەڵبەند.

ئەم چالاکی‌یانـەش زۆربـەیان هاوکـات بـوون بـە چۆڵکردنـی ناوچـەکان لـە هێزەکـانی پێشمەرگەو سەرقاڵ بوونی پارتیزانـەکانی (ی.ن.ك) بـە شـەڕی سـەرکردایەتی درێژخایـەن‌و

شێوەی تازەی جەنگی فراوان لەسەر ئاستی تیپو مەڵبەندەکان. چونکە بەر لەم دەسکەوتە تەراتێنی سیخوڕو جاشو شەوکوتو تالانچی لەسەر ئاوایییەکان گەیشتبووە ڕادەی چڵەپۆپەو مانەوەی ڕەوشەکەش بە چارەسەرنەکراوی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بارودۆخی ناوچەکانی بەرەو ئاڵۆزیو پشێوی سیاسیتر دەبرد. بەڵام ئەزموونی پێکهێنانی هێزەکانی پشتگیری لەکوردستان دا ئەو بارە تفتو تاڵەی نەهێشتو لە ئەنجامی بەرگرییە ناوخۆییەکانی کۆمەڵانی خەڵك دا جۆرێك لە ئارامیو هێمنی کۆمەلایەتی بەدەست دەهێنرێ. کە ئیتر پیاوانی دوژمن زاتی ئەوەیان نەبێ سنورە دیاریکراوەکان ببەزێننو بە ئارەزووی دڵی خۆیان هەڵمەتو پەلاماردانو دزەکردن بۆ ناو ئاوایییەکان دەست پێبکەن.

## ٤/ چارەسەرکردنی بە خۆڕایی گوندنشینەکان

بێبەش کردنی ئاوایییەکانی کورد لە بنکەو خزمەت گوزارییە تەندروستییەکان، هەر بە تەنها هۆیەکەی بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشە یەك لە دوای یەکەکانی کوردو بۆ بەردەوامی بارە نائاساییەکەی ڕەوشی کوردستان، ناگەڕێتەوە. هەر بەتەنها بۆ پاساوی ڕێگرییەکانی هاتووچۆو دوری ئاوایییەکان لە یەکتریو بۆ باوەڕنەبوونی گوایە بە چارەسەری دکتۆرو بەکارنەهێنانی دژە نەخۆشییەکان بۆ داوو دەرمانو دەرزی ناگەڕێتەوە. بەڵکوو لە هەڵقولاوی عەقڵو زادەی بیرێکی ڕەگەزپەرستانەی بەعس بووەو لە سیاسەتی پشت گوێ خستنی کوردستانو خەڵکەکەیدا سەرچاوەیان گرتووە. تا نەهێڵێ کوردان لە پلەیەکی شارستانی پێشکەوتوودا گەشە بە ژیانو کلتوری خۆیان بدەنو هەموو شوێنەوارێکی (نەخۆشیو دواکەوتن) لە نێو کۆمەڵگاکەیان دا بنەبڕ بکەن. هەر بۆیە داگیرکەران هەمیشە کاریان لە پشت ئەو سیاسەتەوە کردووە بۆ ئەوەی دانیشتوانێکی لەش ساغو تەندروست باش لە ناو کورددا پەیدا نەبێتو لەژیان دا ئەوەندەی سەرقاڵیان بکات بە چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی خۆیانەوە، لە داهاتووش دا نیو ئەوەندە هۆشیاری نەتەوەییان پێ نەگاتو بیر لە ئازادیو لەسەربەخۆیی وڵاتەکەیان نەکەنەوە.

لە قۆناغی مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕش دا، سەرەڕای کەمیو سنوردار بوونی تواناکانی پێشمەرگە لە داوو دەرمانو دەرزیو گولاجو حەپو پێداویستییەکانی تری نەخۆشییەکان. هەر هاوولاتییەکی گوندنشین لە پشکنینو چارەسەرکردنی پزیشکی بە خۆڕایی بەهرەمەند بووە، کە ئەیتوانی سەردانی دکتۆری مەفرەزەکە یان کەرتەکە بکاتو بە

پێی دیاریکردنی نەخۆشی‌یەکەی تیمار وەریگرێ. یان یارمەتیدەری پزیشکی ئاوایی بە ئاوایی کۆڵەپشتی داوودەرمانی لە پشت نابوو شان بەشانی مەفرەزەکانی پێشمەرگە لە ناوچەکان دا جەولەی ئەکردو نەخۆشی‌یەکانی خەڵکەکەی چارەسەر دەکرد. لە زۆریەی کاتیش دا نەشتەرگەری بچووکی بۆ ددانو هەڵ ئاوسانی گوێو دومەڵو دورینەوەی خانەکانی پێستی بە هۆکاری بەنجی تایبەتی سڕ کردن ئەنجام ئەداو ناویەناویش بۆ لێدانی دەرزیو پاك کردنەوەی برینەکان، نەخۆشەکانی بەسەر ئەکردەوە. هەروەها گوندنشینەکان ئەو دەمەی لێیان ئەقەوماو نەخۆشی تەنگی بە یەکێکیانی هەڵدەچنی، بە سواری ئۆتۆمبیلو تراکتۆر دێبەدێ سۆراخی پێشمەرگەیان ئەکردو دوای ئەوەی دکتۆری مەفرەزەکەیان ئەدۆزی‌یەوە، ئەیانبردە گوندەکەیانو ئەویش چارەسەری پێویستی بۆ نەخۆشەکەیان دەست نیشان ئەکرد.
لەو سەردەمەش بە دواوە، کە ئیتر دامەزراندنی مەڵبەندەکانی لێ کەوتبووەوە، لە سنوری هەر یەکێکیان دا نەخۆشخانەیەکی گەورەو بە توانایان لە رووی ئامێرو کەلوپەلی چارەسەری پزیشکی‌یەوە دانابوو، کە شوێنی ژمارەیەکی زۆری نەخۆشیان لێ دەبووەوەو لە هۆڵی جیاجیاو ژوری تایبەتی‌دا دروست کرابوون. بە شێوەیەك نەخۆشخانەکان لەسەردەستی چەندین دکتۆرو یارمەتیدەرانی پزیشکیو پەرستاران بەڕێوە دەچونو بە سەدان نەشتەرگەری ناوسكو دەرهێنانی گوللەو پارچەو دەرکردنی ددانو پڕکردنەوەو چارەسەری نەخۆشی‌یە باوەکانی وەرزو ڕۆماتیزمیان دەکرد. گوندنشینەکان پۆل پۆل لە ناوچە دورەدەستەکانەوە روویان لێ ئەکردنو ماوەی چاك بوونەوەی خۆیان تیا بەسەر ئەبردن. بێجگە لەوەش بە دەیان دکتۆرو یارمەتیدەری پزیشکی لەناو تیپەکان دا هەبوون، بەبێ ئەوەی جیاوازی بکەن لە نێوان پێشمەرگەو هاووڵاتی‌یەك دا، وەکوو یەك چارەسەریان بۆ ئەکردن. بەمجۆرەش نەخۆشخانەکانی مەڵبەندو دکتۆرەکانی تیپ، لە کاتی بۆردومانەکانی فڕۆکەو بەکارهێنانی چەکی کیمیایی خنکێنەردا بە سەدان هاووڵاتی کوردو پێشمەرگەیان لە (گوندو سەنگەرەکان)دا لە مەرگ ڕزگار ئەکرد.



## ١/ دروست کردنی جاش.

لە دزێوترین سیاسەتەکانی بەعس بووە، کە تیایدا ویستوویەتی شیرازەی هەموو بەهایەك و ڕەوشتێکی جوان لە نێو کوردەواریدا بشێوێنێ و کۆمەڵگایەك لە خۆخۆرو ڕکابەر بەرهەم بهێنێ کە دواتر بیانکات بە سیخوڕو هەواڵدەر بەسەر یەکترییەوەو لەو نێوانەش دا لە دژی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بیانخاتە گەڕەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش دامەزراندنی دەزگایەك بۆ جێبەجێکردنی ئەو ئامانجانەی بەعس بە ناوی (منظومة استخبارات منطقة الشرقية) لە کوردستان دا، بەو ئاقارەدا بووە کە زۆرترین هەواڵ و دەنگو باس لەسەر دانیشتوانی کوردو پێشمەرگەو چالاکی و جموجۆڵییەکانیان کۆبکاتەوەو هێزێکی (میلیشیا) وەك جاش لە خەڵکانی نەفس نزم و لادەر دروست بکات. بۆ کردەوەکانیان بە پارەو چەك و ئیمتیازەوە پاداشتیان بداتەوە. لەو کارە دزێوو بێزراوانەیان بریتیبوون لە:-

- گرتن و ڕاونانی خەڵکێکی نیشتمان پەروەر.
- هەڵکوتانە سەر ماڵ و کەس و کارو خێزانی پێشمەرگە.
- بۆسەنانەوە لە دەوروبەری شارەکان بۆ ڕاوڕووت کردنی هاووڵاتیان.
- پێشڕەوی و چاوساغیکردنی سوپا بۆ هەڵمەت و پەلاماردانەکانیان.
- شەهید کردنی فەرماندەو پێشمەرگەو کادرە هەڵکەوتووەکانی شۆڕش بە نامەردی.

ئەم دەزگایەش چەندین بەڕێوەبەرایەتی و لقی ئاشکراو نهێنی لەناو شاروشارۆچکەکانی کوردستان دروست کردبوو، کە ئەیتوانی لە کورترین ماوەدا نوێ ترین زانیاری لەسەر بارودۆخ و ڕوداوەکانی ناوچەکان کۆبکاتەوەو بە بروسکەو نوسراوی نهێنی و تایبەتی بۆ دام و دەزگا باڵاکانی ڕژێم بەرزیان بکاتەوەو ئەوانیش لەبەردەم گۆڕانکارییەکان دا هەڵوێستی جیاجیایان لێ وەربگرن. لە کاتێك دا هەر ئەم ناوەندەش ببووە ئاژیری وریاکردنەوەی سوپاکەی بەعس لە ئاشکراکردنی خۆسازدان و کۆبوونەوەی هێزەکانی پێشمەرگە بۆ سەر دادانی کتووپڕ لەسەر مۆڵگاکانیان و داوای ئەوپەڕی ئامادەباشی لێ ئەکردن. هەروەها تاکە سەرچاوەی باوەڕپێکراوی سیخوڕی بوو، لە کاتی هێرش و پەلاماردانەکانی سوپادا پشتیان بە زانیارییەکانی ئەم دەزگایە دەبەست.

مەفرەزە خاصە، یەکێك بوو لە داهێنانەکانی ئەم دەزگایەو لە چەکدارکردنی خەڵکیدا کەڵکی لە کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی کورد وەردەگرت. لە شارێك دا لایەنی کەم مەفرەزەیەك تا دوو مەفرەزەی جاش هەبوون، بە بێ ئەوەی کەس لێیان بپێچێتەوە بە ئارەزووی دڵی خۆیان جەولەیان ئەکردو بە فەرمان و بێ فەرمان جەردەیی و تاڵانییان لەسەر

ڕێگاویان‌و ناو گوندەکان دەرهەق بە هاوولاتیان دەکرد. لە کاتێك دا مەفرەزە خاصە، ببووە پەنایەك بۆ پەیوەندی کردنـی دەیـان کەسـی دەروون لاوازو لـە ڕێ‌دەرچـوو بـۆ ئـەوەی لـەو پێناوەدا چەکی جاشێتی لەشان بکەن. بێجگە لەم دیاردەیـەش چـەندین هۆکـاری تـری وەك (شـەڕو پێکـادانی خێـڵ‌و بـاڵی هـێزە سیاسـی‌یەکان) ببـوون بـە سـەرچاوەیەك بـۆ ئـەوەی مەفرەزەکانی جاش گەشەو فراوانبوون بە خۆیانەوە ببینن.

## ٢/ بە بارمتەگرتنی کەس‌وکاری پێشمەرگە.

ئەم سیاسـەتە، بـەهۆی زیـاتر بوونـی ژمـارەی پێشـمەرگەو چالاکی‌یەکانیـەوە دەسـتی پێکرد، کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕیزەکانی پێشمەرگە پـەرەیان دەسـەندو هەڕەشـەی گـەورەیان لەسەر ئەمن‌و ئاسایشی ڕژێمی فەرمانڕەوا دروست دەکرد. بۆ ئەمەش هەوڵی ئەدا تـاوەکوو ڕێگا بگرێ لەو بەلێشاو هەڵهاتنەی خەڵکی شارەکان‌و پەند بەوانەی تریش دابـدا کـە بـیر لـە پێشمەرگایەتی ئەکەنەوە. ئەیویست ئازیزترین و خۆشەویسترین کەسانی پێشمەرگە ڕاپێچی نێو گرتووخانەکان بکـات‌و لـە ژێـر گوشـاری ئـەمان دا چـەکی خـەبات لەشـان نەکـەن. یـان تێکۆشەرانی نێو سەنگەرەکان ملکەچی خۆبەدەسـتەوەدان بکـەن‌و دواتـر لـە ژێـر چـاودێری وردی دام‌و دەزگا ئەمنی‌یەکان دا ژیان بەسـەر بـەرن. پـێ‌ی وابـوو ئیـتر جوڵانـەوەی کـوردو شۆڕشە هەڵگیرساوەکەی پێ لەناو دەبرێ‌و چیاو دەشتەکان لە پێشمەرگە بەتاڵ دەبنـەوە. بـەلام هـەرزوو سیاسـەتەکەی هەڵوەشـایەوەو بـەردەوام بوونـی خـۆی لەدەست دا. چونکـە کۆمەلانی خەڵکی نەك هەر تەنها بەو توندو تیژی‌یە چاوترسێن نەکردو خۆیان بـە هەڕەشـەو گوڕەشەکانیەوە نەبەستەوە، بـەڵکو جەماوەرەکـەی زیـاترو زۆرتـر بـۆ دەسـت دانـە چەك‌و ڕاکردن بۆ دەرەوە خرۆشاندو بە زەنگێکی وا هـەموو لایـەکی لـەوە ئاگـادار کـردەوە کـە لـە بەرنامەی حزبی دەسەلاتداردا هیچ جیاوازی‌یەك لـە نێـوان پێشـمەرگەیەکی شـاخ‌و کوردێکـی شاردا ناکرێ.

ڕژێم لە سەرەتاکانی جێ‌بەجێ‌کردنی سیاسەتەکەی‌دا، بە توندترین شێواز کەوتە زینـدانی کردنی کەس‌وکاری پێشمەرگە لە باوك‌و دایك‌و خوشك‌و براو ژن‌و منداڵـەکانی‌و لـە نێـو قـەلای عەسکەری‌و گرتووخانە مەدەنی‌یەکان دا دەست بەسەریانی کرد. لەو ماوەیەش دا تاڵ تریـن ژیانی ژێردەسـتـەیی پـێ‌یـان نیشـان داو لەسـەردەمی پیـاوانی پۆلیـس‌و ئاسایشـەوە پـێ‌یـان دەوترا کـە ئیـتر ئـەو جێگایـە شـوێنیان ئـەبێ‌و تیـایدا ئەمێننـەوە، یـان ئـەوەتا کـوڕو بـراو

مێردەکانیـان خۆیـان بەدەسـتەوە دەدەن. بـەڵام بـەعس کـە دوایـی بـۆی دەرکـەوت سیاسەتەکەی هیچی لەباردا نی‌یەو پەیوەندی‌کردن لەچاو جاران بە هێزەکانی پێشـمەرگەوە رووبان لە زیاتر بوونە. بۆیـە بایدایـەوە سـەر سیاسـەتی کۆچ پێکردنـی خێزانـەکان‌و بـەرەو ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی پێشمەرگە ئاوارەیانی کرد. دواتر لە بڕیارێك دا بە ژمارە (١٦٠) لە ٢٦/ی مارتی ساڵی (١٩٨٧)دا هەموو پێداویستی‌یەکی گواستراوو نەگواستراوی لەو خێزانانـە بێبەش کردو لە موزایەدەی (نهێنی‌و ئاشکرا)دا هەرزان فرۆشیانی کرد.

لەبەرزترین قۆناغەکانی ئەم سیاسەتەش، گرتن‌و لە سێدارەدانی کەس‌و کاری پلـە یـەکی پێشـمەرگە بـوو. بـەو پێیـەش پـارەی گوللـەکان‌و بـاجی مـاندوبوونی هـەڵگرتن‌و دانـەوەی تەرمەکـەیان لـە خێزانەکـەی دەسـەندو هەرەشـەی دڵنـانی پرسـەیان لێ ئـەکردن. هـەروەها پیاوانی سیخوڕو ئەڵقەلەگوێیانی بەعس لـە تـەراتێنی پلـەو پایـەو لـە وەرگرتنـی پاداشـتی خوێنی کوردان بوون، کە هەر یـەکێکیان سـەرقاڵ بـوون بـەوەی ژمارەیـەکی زۆر لـە کـەس‌و کاری پێشمەرگە بدات بە دەسـتەوەو لـەو بڕە پـارە خەیاڵی‌یـە بەهرەمـەند بێـت کـە بۆیـان تەرخان کرابوو. ئەمـەش هاوکـات بـوو لەگـەڵ کارەسـاتەکانی کۆمـەڵکوژی‌و ئـەنفال کردنـی ئاوابیەکانی کورد. کە چۆن بەرنامەکەی بە دڕندانـەترین شـێوە لـە ئاوابیـەکان دا جێبـەجێ دەکرد. بە هەمان شێوەش لەناو شارەکان دا پرۆسـەی ڕاونـان‌و گرتـن‌و لـەناوبردنی کـەس‌و کاری پێشمەرگەو خێزانەکانیان بەرێوە دەچوون.

## ٣/ بنیات نانی قەڵای عەسکەری

مێژووی بنیات نان‌و دروست کردنی قەڵاو قوللـە سـەربازی‌یەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ سـاڵانی نێوان (١٩٧٩- ١٩٨١)، ئەو ساڵەی کە تیایدا پۆستی سەرۆکایەتی دەوڵەت لە لایەن (أحمـد حسـن البکـر)ەوە درا بـە (صـدام حسـین)و لـە کوردسـتان دا بەسـەرەتایەك لـە دەسـتپێکی کارەکانی ئەژمێردرێ. بۆ ئەمەش هات‌و هەریەکەلە قەڵاکانی لە نێوان چەند ناوچەیەك دا لـە دەرەوەی شـارو شـارۆچکەکان دروسـت کـردو لـە فراوانـترین ڕووبـەردا لایـەنی کـەم جێگـای (٥)هەزار سەربازی شەرکەریان لێ ئەبووەوە. ئەمەو سەرەرای ئەو توانا جەنگینـەی قـەڵاکان لە رووی تفاق‌و تەقەمەنی‌و ئیدارەدانی شەڕکردنەوە کە ئەیانتوانی بەرگـەی چـەند مـانگێکی پەلاماردان بگرن.

بەو پێیەش قەڵاکان لە یەك کات دا دوو ئامانجی عەسکەری‌و سیاسـی‌یان لـە پشـتەوە بـوو. تاوەکوو ڕژێمی داگیرکەر تەوەرە ستراتیجی‌یەکان مکوم ترو چەسپاوتر بکات‌و بـۆ درێژترین

مەودای حوكم كردن لە كوردستان دا بمێنێتەوە. كە یەكەمیان خۆی لە بەرگری سەربازیدا ئەبینییەوە، واتە پاش ئەوەی هێزەكانی لە ناوچەكان دا تێك ئەشكێنو تولناكانی شەڕكردنیان لە دەست دەدەن، بۆ ئەوەی دالّدە بۆ قەلاّكان بەرنو خۆیانی تیا ڕێك بخەنەوە. دووەمیان بریتیبوو لە دروست كردنی گرتووخانەیەك بۆ زیندانی كردنو هەلّواسین، تا لە نزیكەوە ئازارو ئەشكەنجەی شارنشینو گوندەكانی تیا بداتو لە بارودۆخی نادیاردا بێ سەروشوێنیان بكات.

بۆیە لە هەشتاكان دا، كە شۆڕشی كوردستان پێی نایە سەردەمێكی تازە لەبەرگری كردنو دانانی نەخشەو بەرنامەی شەڕ كردن بۆ دەرپەڕاندنی پێگەو مۆلّگەكانی دوژمن لە ولاّت دا. ئیتر قەلاّكان بوون بە تاكە ئومێدی سوپاكەی بەعس، كە هەم بتوانن جەنگێكی فراوانو یەكلایی كەرەوەیان تیا بەرپا بكەن، هەمیش بیان كەن بە سەكۆیەك تا هێرشو پەلاماردانەكانیان بۆ سەر ئاواییەكان دەست پێ بكەن. هەروەها قەلاّكان ببوون بە ناوەندێك لە پاش ئەنجام دانی هەر شالاّوێكی سەربازی بۆ سەر ناوچەكان، بە دەیان هاوولاّتی گوندنشینیان لە نێو زیندانەكانی توند ئەكردو تا ئەو كاتەی ماوەی لێكۆلّینەوەو فەلاقەكردنیان تیا بەسەر ئەبرد، یان ئەوەتا ژمارەیەكیان لێ ئازاد ئەكرانو ئەگەڕانەوە سەر ژیانوگوزەرانی خۆیان، یان لەسەر هەندێكیان فرمانی دەسبەجێی لە سێدارەدانیان دەرئەچوو.

لە پرۆسەی ئەنفالەكان دا، دیل كراوی گوندنشینەكان لە ژنو پیاوو منالّو گەورەسالّو لاوەكانیان بە سواری زیلو ئیفاو ئۆتۆمبیلی داخراو بەرەو قەلاّكان دەبردو پاش ئەوەی دایك لە كۆرپەلەو باوك لە كوڕو كچان لە گەنجەكانو هاوسەر لە مێردەكانیان جیائەكردەوە، لە كارەساتێكی نەتەوەییدا بە دەیان هەزار كەسیان لە ناو (ئەشكەنجەو ئازاردانی جەستەییو ویژدانی، نەبوونی خۆراكو تینوێتیو گەرماو سەرما بوون، كەم توانایی پیرو منالاّنی تەمەن، ئالودەبوونی جێگاو ڕێگاو كەلەك بوونی زیندانییەكان بەسەر یەكتریدا، بلاّوبوونەوەی نەخۆشییەكان وەك (گرانەتاو سكچوونو ڕشانەوە) گیان لەدەست دەدەنو بە دەیان هەزاری تریان لە دوای گوللەبارانو زیندە بەچالّ كردنیان لە ناوەوەو دەرەوەی قەلاّكان، خۆلّو خاك بەسەریان دا دەكرێن.

  

## ٤/ هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ.

فرە سوپایی، ئەگەرچی هۆکارێکی سەرەکی بووە لە بەرپا بوونی دەیان شەڕو پێکادانی خوێناوی لە نێوان هێزە سیاسی‌یەکانی کورد لە کاتی خۆیدا، بەڵام بوونی وتارێکی یەکگرتوو ئەیتوانی کێشە لاوەکی‌یەکان بنەبڕ بکاتو درزی ناکۆکی‌و ململانێکان نەگەیەنێتە رادەی توندوتیژی‌و بەکارهێنانی چەك بۆ لابەلاکردنەوەیان. چونکە وەك دواتر دەرکەوت دامو دەزگا سیخوڕییەکان ئەو بارودۆخانەی شەڕەناوخۆییەکانیان قۆستەوەو بە دەیان بکوژو پیاوی تیرۆرستیان بۆ ناوچەکان ناردبووە دەرەوەو بە ناوی (لایەن‌و گروپ)ە ناکۆکەکانی سەرگۆڕەپانی کوردستان قسەیان ئەکردو دانیشتوانی گوندەکانیان لە سزای پشتگیری‌و هاوکاری کردنی هێزەکانی (ی.ن.ك) وریا ئەکردەوە. بەڵام لە زۆربەی کات دا خۆیان لەبەر چاو ون دەکردو هەڵدەستان بە:-

- شەهید کردنی پێشمەرگەکانی یەکێتی لە کاتی مۆڵەت وەرگرتن دا.
- بۆسە نانەوەو تەقەکردن لە مەفرەزەکانی یەکێتی لەسەر رێگاکانی رۆیشتن‌و هاتنەوەدا.
- کوشتنی نیشتمان پەروەران‌و کەسایەتیە ناسراوەکانی کورد لە ناو گوندەکان دا.
- رووت کردنەوەی کاروانچی‌و ئۆتۆمبیلی هاوولاتیان لەسەر رێگاو بانەکان.
- وەرگرتنی پارەو پول بە ناوی گومرگو باج‌و سەرانەی جۆراوجۆرەوە.

بێ لەوەش ژمارەیەك لەو پیاوە بکوژانە تێکەڵ بە لایەنە سیاسی‌یەکان ببوون‌و لە پەناو پەسێوی ئەوان دا دەستێکی نامەردانەیان لە پێشمەرگەو هاوولاتیانی گوندنشین ئەوەشاندو ئەچوونەوە باوەشی رژێم. دوای ئەوەش ناوچەکەیان بەرەو ئاڵۆزی‌و شەڕێکی لابەلا ئەبردو لە جیاتی سەرقاڵ بوون بە لێدانی بنکەو بارەگاو مۆڵگا سەربازی‌یەکانی حکومەتی عێراق، جەنگێکی ناوخۆیی‌و کورد بە کوشتندانی کورد بەرۆکی هێزەکانی پێشمەرگەیان دەگرت. چونکە پێکادانێکی بچووك تەنها بەس بوو لە هەڵگیرسانی شەڕێکی فراوان داو ئەوساش هەموو ناوچەکان بگرێتەوە. لایەنەکان لە بری بەدواداچوون‌و دۆزینەوەی هۆکارەکانی ئەو رووداوانە، کە کێ‌و کام دەستەو تاقم لە پشتی‌یەوە وەستاون، دەسبەجێ گیانی تۆڵەکردنەوە بەسەریان دا زاڵ دەبوو، پێش ئاوابوونی خۆر کامی دڵی خۆیان هەڵئەڕشتو بۆ رۆژانی دیکەش ئەوەی پێیان دەکرا، درێخی‌یان نەئەکرد. هەر لە ماوەی چەند رۆژێك دا هێزەکانیان کۆدەکردەوەو لایەك ئەیویست لایەکەی تر لە ناوچەکەدا دەربەرێنێ. بەڵام بێ ئەوەی سەرکردایەتی هیچ لایەکیان بەمە بزانێ، شەڕ لایەکی بە لایەك دا ئەکەوت، ئینجا

مەواڵەكە بە هەردوو لایان ئەگەیشت. چونكە تا ساڵی (١٩٨١) هیچ هۆكارێكی پەیوەندی كردن لە نێوان سەرەوەو خوارەوەدا نەبوو، هەتا هەڵوێست لە ڕووداوەكان وەربگرن و چارەسەری پێویستیان بۆ بدۆزنەوە. بۆیە دوای ئاگاداربوون لە كۆتایی شەڕەكان، زۆر كار لە كار ترازا بوون.

لەسەرویەندی ئیمزاكردنی زنجیرەیەك ڕێكەوتننامەی ئاشتی لە نێوان هێزە سیاسییەكان دا، كە یەكەمیان لە مانگی (٤)ی ساڵی (١٩٨٦)و دواتریان لە مانگی (١١)ی ئەو ساڵەدا بەڕێوەچوو، بناغەی یەكێتییەكی هاوپەیمانییان دروست كردو بە تێكڕای لوولەی تفەنگەكانیان بەرەو سەنگەرەكانی دوژمن ئاراستە كرد. لەو بەروارەوە چیتر بواریان نەدا خوێنی تێكۆشەران لە شەڕی ناوخۆدا بڕێژن و ئەو ڕووداوانەی لەمەوبەر دووبارە ببنەوە. بەڵكوو شان بەشانی یەكتری چاكی خەبات و شۆڕشیان لێ هەڵماڵی و چەندین چالاكی هاوبەشیان هەر لە لێدانی قافڵەی عەسكەری و ڕزگاركردی زنجیرە شاخ و گرتنی شارۆچكەكان پێكەوە ئەنجام دەدا.

## ٥/ بە بەعسی كردنی (بیروباوەڕی كورد بوون)

بەعسیزم، بزاوتی حزب و بەرنامەیەك بووە، نە لەڕابردووی كۆن دا لە پێناوی بەرژەوەندییە باڵاكانی گەلی كوردستان دروست بووە، نە دواتر دروشم و ئامانجەكانی بە خەڵك و خاكەكەی بەستۆتەوە. بەڵكوو لە پێناو ویست و خواستەكانی عەرەب لە دایك بووەو پرۆژەكەی دامەزراندنی یەكێتییەكی پان و پۆڕی قەوارەی عەرەب بووە لە داهاتوودا. ئەم ئامانجەشی وەك ستراتیژ بەڵگەنامەیەك لە دووتوێی (المنهاج الثقافي المركزي) ناوخۆی بەعس دا بڵاوكردۆتەوە كە هاتووە:- (أن الوحدةالتي يسعى إلى تحقيقها حزب البعث العربي الإشتراكي هي {الوحدة العربية الشاملة} التي تنتظم كل الأقطار التي يعيش فيها الشعب العربي) یان لە مەرجەكانی ئەندام بوون دا، بە پێی (النظام الداخلي للحزب) هاتووە:- (لكل مواطن أو مواطنة في الوطن العربي، و لكل عربي أو عربية في المهجر الحق في طلب الإنتماء للحزب).

لەمەوە بۆمان دەردەكەوێ، كە كاركردنی بەعس و بەرنامەی حزبەكەی تەنها بۆ عەرەب و هاووڵاتیانی عەرەب بووە لە ناوەوەو دەرەوەی وڵاتانی عەرەب داو هیچ ئامانج و دەسكەوتێكی نەتەوایەتییان بۆ كوردو نیشتمانەكەی پێ نەبووە هەتا گەلەكەی شان

بەشانی بەعس کاریکەن. بەڵکوو خاك‌و نەتەوەکەیان پشت گوێ خستووەو خاوەندارێتی هەموو بەهاکانیان بە هی نیشتمانی عەرەب داناوە. ئەمە وێڕای پێکەوە ژیانی چەندین پێکهاتەی (نەتەوەیی‌و زمان‌و ڕەگەزی جیاجیا) لەناو سنوری بەناو وڵاتە عەرەبیەکان دا کە هیچ مافێکیان تەنانەت بۆ ژمارەو بوونیان دانەناوە، وەك خۆیان لە دەستوری حزبەکەیان دا ئامازەیان بۆی کردووە:- (هذه الرقعة الواسعة التي حددها دستور الحزب بأنها [البقعة التي تسكنها الأمة العربية والتي تمتد مابين جبال طوروس و جبال پشتكۆيه و خليج البصرة و البحر العربي و جبال الحبشة و الصحراء الكبرى و المحيط الأطلسي و البحر الأبيض المتوسط]). بۆیە سیاسەتی بە بەعسی کردنی کوردان، ئەم ئامانجە دوورونزیکانەیان لە پشتەوەبووە:- بۆ ئەوەی..

- کورد لە شارستانی‌و لە کولتوری نەتەوایەتی خۆی نامۆ بکات.
- سنوری جوگرافی لە نێوان دانیشتوانی عەرەب‌و کوردستان دا نەهێڵێ.
- کۆمەڵی کوردەواری لەناو بۆتەی دانیشتوانی عەرەب دا بتوێنێتەوە.
- هەست‌و ویژدانی کورد بە ئەدەبیاتی بەعس گۆش بکات.
- ئەندامەکانی کۆمەڵ بکات بە چاودێر بەسەر یەکتریەوە.
- کورد لەبەر چاوی کورد ناشیرین‌و سوك بکات.
- دوودڵی‌و گومان درز بخاتە نێو ڕیزەکانی گەلەوە.
- چەکی پارێزگاری کردنی دام‌و دەزگاکانی بەعسیان پێ هەڵبگرێ.
- بۆ دژایەتی شۆڕشی کوردستان‌و بزوتنەوەکەی بیانخاتە گەڕەوە.
- خەڵکێك بە بیانووی پەیوەندی کردن بە جوڵانەوەی کوردەوە لە سێدارە بدرێن.

بەلام بەعس بە درێژایی (٢٠) ساڵ‌و بەهۆی کاروکردەوە نامرۆڤانەکانیەوە، نەك هەر نەیتوانی یەك لەسەر چواری کورد بکات بە حزبی‌و جەماوەرێکی کەم بە بەرنامەو دروشم‌و سیاسەتەکانی هەڵخەڵەتێنێ، بەڵکوو کوردەواری کرد بە نەیارو دوژمنێکی سەرسەختانەی بەعسیزم لە کوردستان دا.

  

## ٦/ پرۆسەی ڕاگواستنی بەزۆرەملێ.

لە چەند قۆناغو هەلومەرجێکی جیاوازدا، پرۆسەی ڕاگواستنو دەرکردنی دانیشتوانی ڕەسەنی ئاواییو شاروشارۆچکەکان بەڕێوەچوون. کە هەر یەکێکیان لە تەوەرێك دا کاریان بۆ سەرکەوتنی ستراتیژەکەی بەعس لە ئایندەدا دەکردو خۆیان لە (سەرکوت کردنی جوڵانەوەی کوردو بەعەرەب کردنی شارەکانو نیشتەجێ کردنی جوتیارانی عەرەب لە ناوچەو لە ئاواییەکانی کورددا) دەبینییەوە. بەو پێیەش دەرپەڕاندنی کورد لەزێدی باوباپیران چەند شێوازێکیان لە پرۆسەی ڕاگواستن دا لەخۆگرتبوو، لەوانەش:-

### ا/ ڕاگواستنی گوندو شارۆچکەکان.

پرۆسەی یەکەمیان ساڵی (١٩٧٨) بە چۆڵکردنی ئاواییەکانی سەرسنوری (عێراق-ئێران)و (عێراق-تورکیا) دەستی پێکرد. پاش ئەوەی لەلایەن بەعسەوە بەسەدان گوندو بە قوڵایی (٢٠)کم لە ناوچەکان دا ڕادەگوێزرێنو دانیشتوانەکەی لە ئۆردوگا زۆرەملێکان دا نیشتەجێ دەکرێن، ئاواییەکان بە شۆفڵو دینامێتو بلدۆزەر لەگەڵ خاکەکەیدا یەکسان دەکەن. بەڵام پرۆسەی دووەمیان کە ڕاگواستنی شارۆچکەکان بوو، هاوکات بوون لەگەڵ فراوان بوونی کەوانەکانی جەنگی (عێراق-ئێران) لەسەر سنورەکان لە لایەکەوەو دواتر پەرەسەندنی چالاکییەکانی پێشمەرگەش لە ناوەوە، زەمینەو قۆناغێکی تر بوون بۆ ڕاگوێزانی دانیشتوانی شارۆچکەکان لەلایەکی ترەوە.

### ب/ ڕاگواستنی کوردی شارەکان.

ئەم پرۆسەیە بە ئامانجی کەم کردنەوەی ژمارەی کوردی ئەو شارانە بوون کە کەوتبوونە هاوشانی عێراقی عەرەبو لە ڕووی دیموگرافییەوە کورد زۆرینەیان لەو شارانەدا پێك دەهێناو بەپێی ستراتیژی بەعسیش مەترسییان لەسەر (ئەمنی قەومی عەرەب لە عێراق)دا دروست دەکرد. بۆیە ساڵی (١٩٨٠) بە دواوە، بە سەدان خێزانی کوردیان لە شارەکان دا کرد بە سووتەمەنی ئەو سیاسەتەو بە ماڵو منداڵیانەوە بەرەو ناوەڕاستو باشووری عێراق (ترحیل) کران. یان بە تۆمەتی براو کوڕو پیاوو کەسوکاری پێشمەرگەوە بۆ ناوچەکانی بەناو (حوکمی زاتی) دور خرانەوەو لە هەموو مافێکی زەوی، خانوو، شوێنی کارکردن بێبەش کرانو عەرەبی هاوردەیان لەسەر ماڵو گوزەرانیان نیشتەجێ کرد. جیا لەوەش هەر خێزانێکی عەرەب دوای گواستنەوەی (نفوس)و بارکردنی ماڵەکەی بۆ یەکێك لە شارە کوردییەکان بەهرەمەند بوو بە ئیمتیازی (١٠)هەزار دینار، وەرگرتنی پارچەیەك زەوی،

سلفەی عەقاری بۆ بنیات نانی خانووەکەی، دامەزراندنی ئەندامانی خێزانەکەی لەناو دامو دەزگاکانی دەوڵەت دا.

**ج/ ڕاگواستنی گوندی ناوچە نەوتی و تێکەڵاوەکان.**

ئەم ڕاگواستنە لە مێژ ساڵ بوو ڕژێمە فەرمانڕەواکەی بەعس کاری لەسەر ئەکردو لە بەرنامەیدا بوو هەموو مۆرکێکی نەتەوایەتی کوردبوون لەسەر ناوچەکان دا بسڕێتەوەو بیانکات بە عەرەب. هەر بۆیە لەم قۆناغەش دا بەناوی لەوەڕاندنی ئاژەڵو مەڕوماڵاتەوە بە هەزاران خێزانو عەرەبی دەوارنشینی بۆ ئاوایی و ناوچە کوردنشینەکان گواستەوەو لە مانەوەیان پشتیوانی دەکرد. بە سەدان بیری ئیرتیوازیو پرۆژەی ئاویان بۆ دەستەبەرکرانو زەویوزاری کوردی ناوچەکانیان بەسەرا دابەش کردن. بە شێوەیەك پێکادانی (کورد-عەرەب)یان لێ کەوتەوەو بە هاندانی ڕژێم گوشاری دەرونیو بێزاری ئەوتۆیان خستە سەر جوتیارانی کورد تا ناوچەکانیان پێ بەجێ بهێڵن. هەروەها بە بیانووی پشکنینو گەڕان بۆ دۆزینەوەی کانە نەوتییەکان چەندین ئاوایی کوردیان لە دانیشتوانەکەی چۆڵ کردو ناویان لەسەر نەخشەی کوردستان سڕییەوە.

## ٧/ بەعەرەب کردنی نیشتمانو نەتەوە.

لە مێژووی تازەو کۆنی سیاسەتی بە عەرەب کردنی کوردستان دا، ئەگەرچی ڕواڵەتی کۆچو گواستنەوەو نیشتەجێکردنی بنەماڵەو هۆزو خێزانی عەرەبو داگیرکردنی زەویو ئاوو گوند لە ناوچە کوردنشینەکان دا، تەرزێکی باوی ئەو قۆناغانەی تەعریبو لەپاشان هی سەرانی بەعسو ساڵانی بەر لە هەشتاکان بووە. بەڵام لەسەر دەستی (صدام)و دامو دەزگا ئەمنیو ئیستیخباراتییەکانی گەیشتە ڕادەیەك ئەو مەودایانە تێپەڕێنێو عەرەباندنی کوردو نیشتمانەکەی هەموو بوارێکی (کولتوری، دیموگرافی، فەرهەنگی، شارستانی، مێژوویی، ناسنامە)ی گرتەوە. بەو ئامانجەی لە پرۆسەیەکی درێژخایەن دا، شوناسی نەتەوەیی کورد لە ناو بۆتەی دانیشتوانی عەرەبو عێراق دا بتوێنێتەوە. لەوانەش:-

- بە عەرەب ئامارکردنی ناوی کوردو بنەماڵەو ڕەگەزی کوردان لە سەرژمێرییەکانی ناوەوەو دەرەوەی شارەکان دا.
- هێنانی عەرەبی دەوارنشین لە ناوەڕاستو خوارووی عێراقەوە بۆ ناوچەکەو جێگیرکردنیان لەسەر ئەرزو ئاوو گوندی جوتیارە کوردەکان.

- دروست کردنی لادێی عەرەب نشین و چەکدارکردنیان بە چەکی جیاجیا لە دەوروبەری شارەکان دا بۆ دژایەتی کردنی ئاواییەکانی کوردو جولانەوەی گەلی کوردستان.
- بە عێراقی و عەرەب کردنی شوێنەوارە دێرین و دۆزراوەکانی سنوری کوردستان بە بەشێکی جیانەکراوە لە شارستانیەتی عەرەب.
- دان نەنان بە (هەرێمی کوردستان) وەك پێکهاتەیەکی نەتەوەیی و جوگرافی سەربەخۆ، بەڵکوو ناوبردنی بە (الشمال العراق) وەك مەڵبەندێکی نیشینگای عەرەب.
- گۆڕینی ناوی ڕەسەنی شارو شارۆچکەکان. وەك شاری (کەرکوك) بە (التأمیم)و قەرەهەنجیر بە (الربیع)و (ڕەواندن) بە (الصدیق)و هیتریش.
- گواستنەوەی هەزاران خێزانی عەرەب لە باشورەوە بۆ شارە کوردنشینەکان لە بەرامبەر ئیمتیازێکی ڕژێم.
- هەڵگرتنی وانەی قوتابخانەکان بە زمانی کوردی و سەپاندنی خوێندن بە زمانی عەرەبی لە خوێندنگاکانی شارە کوردنشینەکان دا.
- تۆمار نەکردنی ناوی (کوردی) بۆ لە دایك بوانی نوێ لە فەرمانگەکانی ڕەگەزنامەی باری شارستانی عێراقی‌دا بۆ سنوری ناوچەکانی تەعریب.
- وێران کردنی بازاڕو دوکان و خانووبەرەی هاوولاتیانی کورد لەناو شارەکان دا، بەمەبەستی ئاوارەکردن و دورخستنەوەیان لە گەڕەك و ناوچە کوردنشینەکان.
- قەدەغەکردنی دامەزراندن بۆ هەموو هاوولاتی‌یەکی کورد لە دام و دەزگاکانی دەوڵەت دا، سەرەڕای بوونی مەرجەکانی پێویست لەو بارەیەوە.
- بنیات نانی دەیان گەڕەك و کۆلانی عەرەب نشین لەناوجەرگەی شارەکان دا، بۆ ئەوەی کوردەواری لە ڕێی تێکەلاوبوونەوە بکات بە عەرەب.
- کۆسپ دانان لە ڕێگای دروست کردنی بالەخانە، دەرکردنی تاپۆ، نوێ کردنەوەی خانووبەرە، بوون بە خاوەن زەوی، دوکان، بەشداری کردن لە (مزایدة) بازرگانی‌یەکان.
- بە عەرەب کردنی ناوی هەموو شەقام و گۆڕەپان و گەڕەك و خوێندنگاو کتێبخانەو دۆڵ و ڕووبارو لوتکەو شاخ و دەشتێکی کوردستان.

هەروەك لە تازەترین مۆدێلی داهێنانی تەعریب دا، گواستنەوەی (یەکەی ئیداری) شارو شارۆچکەکان بوو بە ئامانجی کەم کردنەوەو لابردنی چەند شارێکی کوردنشین لە ژمارەی ڕەگەزی دانیشتوانەکەی لە سەرێکەوەو لکاندنی هەندێکی تریان بە یەکەی کارگێڕی شارە

عەرەب نشینەکان لە سەرێکی ترەوە بە ئامانجی کردنیان بە عەرەبو داماڵینیان لە سنوری جوگرافیای نەتەوەیی، کە کاریان بۆ لەناوبردنی ناسنامەو پاکتاوی ڕەگەزی کوردان ئەکرد. لەوانەش دەرکردنی هەردوو شاری (چەمچەماڵ)و (کەلار) لە سنوری ئیداری (کەرکوک)و گواستنەوەیان بۆ سەر شاری بەناو حوکمیزاتیو لە پاشان لکاندنی شارەکانی (کفری)و (دوزخورماتوو) بە یەکەی ناوچە عەرەب نشینەکانی (دیالە)و (صلاح الدین)ەوە. هەروەها قەدەغەکردنی خانوو کڕین بۆ هاوولاتیانی کورد لە سنوری پارێزگاکانی (موسڵو دیالەو کەرکوک).

## ٨/ تەسفیرکردنی هاوولاتیانی فەیلی.

فەیلی.. یان لوڕی بچووك، پێکهاتەیەکی نەتەوەیینو شان بەشانی هۆزو بنەماڵەکانی تری کوردستان، خەڵکی نیشتمانو گەلە ئازادیخوازەکەی پێکدەهێنن. لەئەنجامی بەشداری کردنیان لە شۆڕشی کوردستانو خەباتە ڕەوالکەی گەلەکەیان دا، بەردەوام ڕوبەڕوی چەوسانەوەی ئەتنکیو ڕاگواستنو دەربەدەریی بوونەتەوە. لە کۆتایی حەفتاکانیش دا چەوسانەوەی (مەزهەبی) بەرۆکیان دەگرێو بە ناوی تەبەعیەی ئێرانیەوە تۆمەتی جیاجیا دەخرێتە پاڵیانو لە چەندین شاڵاوی ڕاگواستنو تەسفیرکردن دا ئاوارەی ئێرانو شارەکانی تری عێراق دەبن. بۆیە سەرانی بەعس لە قۆناغی بەر لە هەڵگیرساندنی شەڕەکەیان لە دژی ئێران، گەورەترین شاڵاوی تەسفیرکردنی (کوردە فەیلیەکان) لە مانگی (٤)ی ساڵی (١٩٨٠)دا بۆ ئێران دەست پێدەکەنو دوای ئەوەی ڕاگوێزراوەکان هەموو مافێکی (هاوولاتیبوون)یان لێ ئەسەنرێتەوە، دامو دەزگا ئەمنیەکان هەڵدەسن بە:-

- دەست گرتن:- بەسەر زەوی، خانووبەرە، پارەو پول، ئۆتۆمبیل، پێداویستیەکانی نێوماڵ، تەسکەرەی باری شارستانی، ناسنامەی عێراقی، دەفتەری سەربازی، بڕوانامەی خوێندنو پێناسەی ژوری بازرگانی کوردە فەیلیەکان.
- ئازاردانیان:- لە کاتی گرتنو گواستنەوەدا بۆ ناو گرتووخانەکانو لەوێشەوە فەلاقەکردنو ئەشکەنجەدانیان بە کێبڵو داروسۆندەو ڕەوانەکردنیان بۆ سەر سنورەکان لە ژێر پاڵەپەستۆی چەندین شێوازی قسەی ناشیرینو جۆری سوکایەتی پێکردن دا.

- **برسی و تینوو کردنیان:**- لەو ماوەیەی قۆناغی لێکۆڵینەوە و زیندانی کردنیان بەسەر دەبەن، بەبێ ئەوەی پیاوانی ڕژێم خۆراکو بڕی ئاوی پێویستیان بۆ دابین بکەن، یان ڕێگا بە خەڵکانێکی مەدەنی بدەن تا داواکاریەکانیان لە دەرەوە بۆ جێبەجێ بکەن.
- **کۆچ پێکردنیان:**- بە شێوەی قافڵەو لە ژێر گوشاری هێزی سەربازیو ئەمنیدا بەڕێوە دەچن. بە رادەیەك خێزانە فەیلیەکان لەسەر سنورەکانی ئێران ملکەچی چارەنووسێکی نادیاریان دەکەن.
- **بێسەرو شوێن کردنیان:**- کە مەزەندە دەکرێت بە لەناویردنی (٥)هەزار لە (کوڕوکچ)ی لاوی کوردە فەیلیەکان، بەبێ ئەوەی خێزانەکانیان لە بارەی مردنو ژیانی ڕۆڵەکانیانەوە هیچ زانیاریەکیان لەسەر چارەنووسیان هەبێت.

هەرچەندە تا ئێستایش ئامارێکی تێرو تەسەل لەسەر قوربانیەکانی کوردە فەیلیەکان نیە، یان دەرفەت نەرەخساوە سەرژمێریەکی تەواو لەسەر تراژیدیاکانیان بکرێ، بەلام لەسەر زاری خەڵکە کارەساتبارەکەوە چەندین ئامارو خوێندنەوەی جیاجیایان لەسەر دەکرێ. لەوانەش هەندێکیان بە (٥٠٠)هەزار خێزان مەزەندەیان دەکەنو هەندێکی تریان بە (١)ملیۆن هاوولاتی تەسفیرکراو. ڕەنگە ئۆردوگای کوردە فەیلیەکان یەکێك لەسەرچاوەی ئەو ئامارانە بن، یان لەم بارەیەوە دەوڵەتی ئێران لە پەخشی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن دا ئەو ژمارانەی بلاوکردبێتەوە. بەلام پێدەچێ لە ئامارێکی گشتیدا ژمارەی قوربانیەکان لەوە زیاتر بن وەك ئامازەی تر لە سەریان هەیە.

## ٩/ گەمەی ئاخاوتن.

لەگەرمەی چالاکیەکانی پێشمەرگەدا، شۆڕش هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە ئیتر پەلاماردانەکانی بووەستێنێو شێوازێکی تر لە خەبات بگرێتەبەر. داواکاریە یەك لەدوای یەکەکانی ڕژێمی عێراق بۆ گفتوگۆکردنو دانووسان ڕەت نەکاتەوە، ئەگەر لایەنی کەم مافەکانی کوردی تیا جێبەجێ بکات. بە تایبەتی بەعس سەرۆکایەتی شاندی وتووێژی بە

(د. عەبدولڕەحمان قاسملوو) سپارد بوو، بەڵێنی چەسپاندنی هەموو ئەو مافانەی بە شۆڕش دا بوو کە چەندین جار کەس‌و لایەن‌و خەڵکێکی ناسراوی بۆ بنکەو بارەگاکانی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) نارد بوو. بۆیە سەرانی شۆڕش دوای پرس‌وڕا کردن بە کۆمەڵانی خەڵك‌و کادرو ڕێکخستن‌و فەرماندەو پێشمەرگەکانی خۆی، بڕیاری تەقە وەستاندنیان لە ۱۹۸۲/۱۲/۳دا دەرکردو بەرنامەیان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی کورد، لە بەغدا خستە ڕوو.

بەڵام ڕەوتی ئاخاوتنەکان‌و ئەو میکانیزمەی ڕژێمی بەعس بەڕێوەی برد، دەریان خست کە هەموو ئەو بەڵێنانەی بۆ شۆڕشی کوردستان هەڵیان ڕشتبوو لە بنج‌و بنەوانەوە درۆ دەرچوون‌و تەنانەت بۆ یەك جاریش لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنەوە باسیان لە وتووێژەکان نەکرد. بەڵکوو سەرانی بەعس ئەیانویست چەند ئامانجێکی (عەسکەری‌و سیاسی‌و دەروونی‌و کۆمەلایەتی‌و سیخوڕی لە ڕێگای گفتووگۆوە ئەنجام بدەن. لەو ئامانجانەش:-

- پەکخستنی چالاکی‌یەکانی پێشمەرگە. لە کاتێك دا شۆڕش لە قۆناغی ڕزگارکردنی شارۆچکەکان بوو.
- بەسەر بردنی کات بۆ ڕێکخستنەوەی سوپاکەی کە لە جەنگی عێراق-ئێران دا زەرەرو زیانێکی زۆریان لێ کەوتبوو.
- بۆ ئەوەی لە نهێنی فراوان بوونی شۆڕش‌و هۆکارەکانی سەرکەوتنی بگات کە چۆن ڕیزەکانی بشێوێنێ.
- هەوڵ بدات بۆ ئاشکراکردنی تێکۆشەران‌و دۆست‌و لایەنگرانی ڕێکخستن‌و ئەندامەکانیان لەناو شارەکان دا.
- تۆڕی هەواڵگری‌و سیخوڕی کردن لە ناوچەکانی ژێردەسەلاتی پێشمەرگەدا گەشە پێ بدات.
- پیلان بۆ گەڕانەوەی سەدان عەسکەری هەڵهاتوو بگێڕن‌و دواتر ناویان بۆ جاش خەفیفە بنووسن.
- خەڵکێکی نیشتمان پەروەر لە پەنای گفتوگۆوە بە دەستی پیاوانی ئەڵقە لەگوێ‌و جاشەوە تیرۆر بکەن.

– فەرماندەی پێشمەرگەو سیاسی‌یەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەشێوەی جیاجیا شەهید بکەن.

بەعس لە ماوەی وتووێژدا، توانی بەرەی ناوخۆو دەرەوە قایم بکاتو پەیوەندیو هاوکاری کردنی ڕژێمەکەی تەنانەت بە پشتگیری ئەمریکاوە ببەستێتەوە. بۆ ئەم مەبەستەیش لە کاتێك دا پۆستی سەرۆکایەتی لە هەڵبژاردنەکەی ئەمریکادا بۆ (ڕۆناڵد ڕێگان) دەرچوو، صدام حسین یەکەم کەس بوو پیرۆزبایی خۆی لە ناوبراو کردو بە شانازی‌یەوە لە پەخشی ڕادیۆوە بڵاویان کردەوە. دواتر پەیوەندی‌یەکانی هەردوولا بەرەو هەڵکشان چوونو وڵاتانی ئەورووپاش لە پێشکەش کردنی تەکنەلۆجیای عەسکەری‌دا درێخی‌یان لێ نەکرد.

دیار بوو، پشتگیری‌یەکانی ڕژێم لەسەر ئاستی دەرەوەو کەم بوونەوەی پەلاماردانەکانی لەشکری ئێران بۆ ماوەی (١)ساڵو نەبوونی چالاکی پێشمەرگانەش، حکومەتی عێراقیان لە تەپین ڕزگارکردو لە هەموو پەیمانو بەڵێنێکی ڕابردوویان پەشیمان کردەوە. بەڵام شۆڕش دوای (١) ساڵو (٤٢) ڕۆژ لە ئاخاوتن، شەڕی چەکداری وەك باشترین چارەسەر بۆ خەباتی ڕزگاریخوازی گەلی کوردستان دەست پێکردەوە.



## ١٠/ دروست کردنی جاش خەفیفە.

هەلومەرجی ئاخاوتنو ئەو بۆشاییە پێشمەرگەیی‌و سیاسی‌و دەروونی‌یەی لە کوردستان دا دەرفەتیان بۆ ئەش‌و نماو دروست بوونی جاش خەفیفە ڕەخساند، کۆمەڵێ هۆکار بوون، ئەوەندەی سەرچاوەکانیان پەیوەندی‌یان هەبووە بە پاڵنەرو دەستێوەردانی سەرەکی‌و ناسەرەکی دەسەڵاتدارانی بەعسەوە، نیوهێندەش لێپرسراوێتی‌یان بۆ کۆمەڵو تاکەکانی نێو کوردەواری دەگەڕێتەوە. چونکە شکاندنی ڕچەیەك بوو بە پێچەوانەی ویستو داواکاری‌یەکانی گەلی کورد ڕێگای ڕوونو ڕاستەقینەیان وێڵ کرد. کە کاریان بۆ سەرکەوتنی

سیاسەتەکەی لەمەڕ کورد بە کوشـتنـدانی کـورد لـە کوردسـتان دا دەکرد. بـەو پێـیەش لـە جیاتی شـەڕکردن لـە پێنـاوی لاوازکـردنو ڕامـاڵینی لەشـکری داگیرکـەر لـەناو نیشـتمان دا، شۆڕشی کوردستان بەشەڕی کۆمەڵگاو خۆبەخۆی ئەندامەکانیەوە خەریك بکـاتو بەعسـیش لەو نێوانەدا ڕۆڵـی ئـاگرخۆش کردنـی قـەیرانو کێشـە بارگاویـیەکان ببینـێ. هـەروەها ئـەو هۆکارانەی کە بەشداری‌یان کرد لە دروسـت بـوونو زیـاترکردنی دیـاردەی جـاش خەفیفـەدا، گرنگترینیان لەم بوارانەدا بەرجەستە دەبوون:-

- خۆ دزینەوەی سەربازە هەڵهاتووەکانی کورد لە مەیدانەکانی جەنگی عێراق-ئێران دا.
- هەڵڕشتنی پارەیەکی زۆرو ئیمتیازات بۆ ئەوانەی چەکی جاشێتی‌یان هەڵدەگرت.
- بوونی خەڵکانێکی نەفس نزمو نیشتمان فرۆش لەناو کۆمەڵ دا.
- پەرەسەندنی ڕێژەی بێکاری لە نێو شارەکان دا.
- گەورەبوونی ناکۆکی دووسەرە لە نێوان خێڵو بنەماڵەکانی کورددا.
- بوونی بۆشاییەك بۆ هێزی سەربازیو مرۆیی لەناو سوپادا.
- ماندانی ڕژێم بۆ خەڵکانێکی ناسراوی سەر بە عەشیرەتەکان.
- پشتگوێ خستنی ناوچە ڕزگارکراوەکان لە کاتی گفتووگۆدا.
- هەست نەکردن بە لێپرسراوێتی نەتەوەییو نیشتمانی.
- نەبوونی ناوەندەکانی لێپێچینەوە.

بۆیە لە کۆتایی وتووێژەکانی شۆڕشو کاربەدەسـتانی بـەعس دا، ڕژێمـی فـەرمانڕەوا بـە دەیان فەوجی جاش خەفیفەی لە ناو شارو شارۆچکەکان دا دروست کردو جێگای ئەو دەیان یەکـە سـەربازانەی پـێ ئەگرتـەوە کـە بـەردەوام بـەرەکانی شـەڕ ژمـارەو وزەو تواناکـانی جەنگینی عێراقیان هەڵدەلووشـی. لەوانـەش (جلـەوی ڕەبایـەکان، ئـەرکی پاراسـتنی ڕێگـاو بانەکانی ڕۆیشتنو هاتنەوە)، هـەموو لـە ژێـر چـاودێری وردی جـاش خەفیفـەکان دا بـەڕێوە دەچـوون. هـەندێکی تریـان (شـان بەشـانی هێرشو پەلاماردانـەکانی سـوپا) پێشـڕەویو بەشـداری‌یان لـەو هەڵمەتانـەدا بـۆ سـەر ناوچـە ڕزگارکراوەکـان دەکـردو شـەوانەش لـە دەوروبەری شارەکان دا بۆسەی جۆراوجۆریان بۆ ڕێگری لـە هاتنـە نـاوەوەی مـەفرەزەکانی

پێشمەرگە دائەناو دەستیان ئەچووە شەهیدکردنی دەیان پێشمەرگەی ماندوونەناس. هەروەها گەورەترین تاوان لە مێژووی جاش خەفیفەکان دا نووسرابێتەوە، بەشداریان بووە لە تۆمارکردنی تاوانەکانی (ئەنفال)دا. چونکە هەر ئەمان بوون ڕۆڵێکی سەرەکیان لە (دەسگیرکردنی هەزاران هاووڵاتی)دا بینیو وەکوو دیارییەك پێشکەشی سوپاکەی ئەنفالیان کرد.

## ١١/ ژەهری سالیۆم.

چەکی لەناوبردنی نەیارەکانی بەعس بووە. چی لە بەرامبەر ئەو تێکۆشەرانەی لە نێو سەنگەرەکان دا، ڕێی خەباتو شۆڕشیان گرتبووە بەر، چی لە ئاست ئەو نیشتمان پەروەرانەی لە نێو زیندانەکان دا، بەهۆی (ئاوو دەرزیو چاو شەربەتو خواردن)ەوە جێبەجێ کراون. ئەم ژەهرەیش بە شێوەی (گیراوەو پۆدرە) ئامادەکرابوونو لەسەر دەستی (ژنانو پیاوانی سیخوڕو جەللادو ئەمنی ئاشکراو نهێنی)یەوە ئەنجام ئەدران. تەنها ڕێژەیەکی کەم لەو پێکهاتەیە بەس بوو، تا لەماوەی چەند کاتژمێرێك دا چەندین قوربانی لە شەهیدو بریندار بکەونەوەو ژمارەیەکی تریش لە ڕۆژانی داهاتوودا نیشانەی وەك (ڕووتانەوەی سەرو هەڵئاوسانی گەدەو دوانزەگرێو لەکارکەوتنی ماسولکەو جومگەکانو پیربوونی خێرا) لەسەریان دەربکەوێ. بەسەرهاتی لەو جۆرەش لەسەر زمانی کەسوکاری ئەو زیندانییە سیاسییانە دەوترێتەوە کە چۆن دوای ئازاد کردنیان بە ماوەیەکی کەمو لە بارودۆخێکی نادیاردا کۆچی دوایی دەکەنو هەندێکی تریان بەبێ ئەوەی دەستی چارەسەری پزیشکییان پێ بگەیەت گیان لە دەست دەدەن.

لەم ڕووەوە، ڕووداوەکانی کوشتن بە سالیۆم، گەورەتریان لە (سێروان)ی پشت (دوکان-مەرگە) ئەنجام درا. کە تیایدا لە کۆڕێکی نان خواردنی نیوەڕۆدا ژمارەیەك لە پێشمەرگەو کادرو سەرکردەو هاووڵاتی لە خواردنەوەی ئەو (ماستاو)ەدا ژەهراوی کرد، کە بڕێکی فراوان لە ڕێژەی ژەهرەکە لە لایەن ژنێکی سەر بە داموو دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێم خرابووە نێو ماستاوەکەوە. بەو هۆیەشەوە (٢) هاووڵاتیو (١) کادر شەهید دەبنو (٧)ی تریان بە

خەستی بریندار دەبن. دواتر بۆ چارەسەرکردنیان (٥) لە بریندارەکان ڕەوانەی ئێران دەکرێن و لەوێشەوە سیانیان بۆ نەخۆشخانەکانی (لەندەن) دەگوازرێنەوە. هەروەها بەکارهێنانی ئەم ژەهرەش لەلایەن ئەمنی عێراقەوە، جاری یەکەم و دواجاریش نەبووە، بەڵکوو لە سنورەکانی تردا، وەك لە (قەڵاسێوکە- ئاغجەلەر) ڕوویان داوەو بوونەتە هۆکارێکی سەرەکی لە شەهیدکردن و برینداربوونی ژمارەیەك لە پێشمەرگەو کادری یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەبێ ئەوەی تەنانەت هیچ هاوکاری و پشتگیرییەکی چارەسەرکردن فریایان بکەوێت، یان بە هانایانەوە بچێت.

هەرچەندە تەقەلای دیکەش لە ناوچەکانی (گەرمیان و چەمچەماڵ و قەرەداغ) بۆ لەناوبردنی فەرماندەی پێشمەرگەو کادرە سیاسییەکانی (ی.ن.ك) دراون، بەڵام بە هەوڵ و چاوکراوەیی پێشمەرگەو تێکۆشەرانی ڕێکخستن لەناوخۆو دەرەوەدا، پیلانەکانی بەعس بەتاڵ دەکرێنەوەو بەرلەوەی دەستەکانی تاوان نیشانەکانیان بپێکن، ئەنجام دەرانی دەسگیر دەکرێن. لەمەشەوە ڕاستییەکمان بۆ دەردەکەوێ، بارژێمێکی خاوەن چەندین دام و دەزگای ئەمنی کاریان بۆ تیرۆرکردنی دەیان سەرکردەو هاووڵاتی کورد لە ناوچە ڕزگارکراوەکان دا کرد بێت، بەڵام لە ڕووی قوربانییەوە وەك دڵۆپێکی ئاو بووە لە دەریایەکی گەورەدا لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە ئامادە نەبوونی تاکی کورد پیشان دەدات، بەوەی دەستیان نەچێتە سەر ڕژاندنی خوێنی هاوڕەگەزەکانیان لەناو شۆڕشێك دا کە چارەنووسی خۆیانی پێوە بەند بووە.

## ١٢/ تیرۆرو داپڵۆسین لەنێو شارو شارۆچکەکان دا.

لە سەرەتای هەشتاکان دا، ڕەوشێکی نائاسایی و پڕ لە ئاڵۆزی هەموو شاروشارۆچکەکانی کوردستانیان گرتەوە. سادەترین ماف لە ڕووی (گواستنەوە، نیشتەجێ بوون، ڕێکخستنی کاروبار، ڕۆیشتن و هاتنەوە) ڕووبەڕووی وەڵامی توندی دەزگاکانی (ئەمن و تەواری) دەبوونەوە. لە جمووجۆڵی هاووڵاتییەکی کورددا دەیان ترس و گومان و دڵەڕاوکێ لە لایان گەڵاڵە دەبوو. لەمپەری جۆراوجۆریان لەبەردەم کارو پرۆژەی هاووڵاتیان دا دروست

دەکرد. وێڕای ئەو بڕیارە یەك لە دوای یەکەکانی بەعسیش لەسەر مافی بێبەش کردنی هاوولاتی کورد لەناو دامو دەزگاکانی دەوڵەتو دورخستنەوەیانو سەیرکردنیان بە هاوولاتی پلە دوو، گوزەرانی خەڵکەکەی ساڵ بەساڵ بەرەو خراپتر دەبرد. هەروەها لەپاڵ ئەو بارودۆخە نائارامەی لە نێو شارەکان دا دروستیان کرد بوو، چەندین کاروکردەوەی تۆقاندنو تیرۆرستانەیان جێبەجێ دەکرد، لە دیارترینیان:—

— گرتنو ڕاوەدونانو ئەشکەنجەدانی کوردی شارەکان بەبێ هیچ هۆیەك.

— دروست کردنی باندە نهێنیو ئاشکراکانی تیرۆرکردن بۆ شاردنەوەی دەستی تاوانەکانی بەعس.

— قەدەغەکردنی هاتووچۆ لە وەختو ناوەخت دا بۆ ڕەوایی دان بە کوشتنو زیندانی کردنی هاوولاتیان.

— دەسگیرکردنی بەردەوامی لاوە گەنجەکان بە بیانووی کۆبوونەوە کردنو هاندانی خەڵکی بۆ مانگرتنی گشتی.

— پرۆسەی ڕفاندنو بێ سەروشوێن کردنی نیشتمان پەروەرانو خەڵکی بێ لایەن لە نێو شارەکان دا.

— پەیژە دانان بۆ دەسگیرکردنی هاوولاتیان لەلایەن پۆلیسو پیاوانی ئەمنەوە.

— برەودانی ڕژێم بە دیاردەی دزیو تالان کردنی هاوولاتیان لە کاتەکانی شەودا.

— دەرکردنی فەرمان بۆ ئابلۆوقەدانو پشکنینی گەڕەکەکان لە ماوەیەکی کورت دا.

— حەرەسیات گرتن، مانەوە، بۆسە نانەوە، لەسەربانی ماڵەکان دا بە درێژایی شەو.

— دانانی سەیتەرەی جیاجیا لە مەفرەزەی تەواری، ئەمن، ئیزنیات، لە سەنتەری شەقامەکان دا.

— تەقەکردنی کوێرانە بەسەر کۆڵانو گەڕەکەکانی شاردا بۆ ترساندنی خەڵکەکەی.

— گوللەباران کردنی زیندانییە سیاسییەکان، سەربازە هەڵهاتووەکان بەبەرچاوی خەڵکەوە.

— تەخت کردنی خانووبەرە، بازاڕ، ڕیزە دوکان، گەڕەك، بە بیانووی جۆراوجۆرەوە.

— ئازاردانی کەسوکاری شەهید لەکاتی پرسەدانان دا.

ئەم ڕەفتارانەی ڕژێم، نەك هەر نەیانتوانی شەپۆلە تێهەڵچووەکانی تووڕەیی لەناخی کورد بوونی شارەکان دا کپ بکەنەوە، بەڵکو هانیان بدات بۆ شۆڕشو خەبات کردن، هەموو

بنەمایەکی جەورو چەوسانەوە ڕەت بکەنەوە. خۆیان لە ڕێکخستنە نهێنی‌یەکان دا ساز بدەن‌و پەرە بە چالاکی‌و جموجۆڵی سیاسی‌یان بدەن. جەماوەری ستەم دیدە بانگهێشتی نێو ریزەکانیان بکەن‌و هۆشیاریی نەتەوەییان گەشە پێ بدەن. ڕاپەڕینی نێوشارەکان دەست پێبکەن‌و دام‌و دەزگا سەرکوت کەرەکان بسووتێنن. لە شاخ دا چەکی پێشمەرگایەتی هەڵبگرن‌و بە زمانی تفەنگ داوای مافە ڕەواکانی خۆیان بکەن.

## ١٣/ بە زۆر سەپاندنی جەنگی بەرەیی.

یەکێك بووە لە ستراتیژە عەسکەری‌و سیاسیەکانی بەعس. لە لایەکەوە بۆ ئەوەی هەڵمەت‌و پەلاماردانەکانی پێشمەرگە لە مەنگەنە بداتو لەلایەکی ترەوە، تاوەکوو ئاواییەکان هەنگاو بە هەنگاو لە دانیشتوانەکەی چۆڵ بکات. تا ئەو ڕادەیەی چەندین هەزار یەکەی سەربازیی لە هێزی پیادەو هێرش بەرو تانك‌و زرێپۆش‌و تۆپخانەو هەندەسە لە ناوچەیەك دا کۆبکاتەوەو هەرجارەش لە قۆڵێکەوە پەلاماری زەمینی‌و ئاسمانی دەست پێبکات. هەروەها مەیدانەکانی جەنگ لە کەوانەیەکی شەڕدا دیاری بکاتو ڕێگا لە هەڵۆکان بگرێت هەتا شەڕی سوپاکەیان لە ناوچە جیاجیاکان دا ئەنجام نەدەن. بەو ئامانجەش زەرەرو زیانێکی مرۆیی‌و دارایی لە گوندنشینەکان‌و لە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بدەن‌و ناوچەکانیش بۆ ژێر دەسەڵاتی پێشووی خۆیان بگێڕنەوە. دیارە ڕژێمی فەرمانڕەوایش لە پشت ئاراستەکردنی ئەم سیاسەتەوە ویستوویەتی ژمارەیەك ئامانجی سەربازی‌و سیاسی‌و لۆجستکی لە کۆتایی‌دا بپێکێ، کە هەوڵی داوە:-

- هێزەکانی پێشمەرگە لە شەڕی درێژخایەن دا ماندوو بکات.
- تیپەکان، دەست لە چالاکی‌یەکانی شەڕی پارتیزانی هەڵبگرن.
- خەرجی‌یەکانی جەنگ قورساییەکی زۆر بخاتە سەر داراییەکانی (ی.ن.ك)ەوە.
- هەموو توانایەکی پێشمەرگەیی‌و ئیداریی شۆڕش بخاتە ناو جەنگەکەوە.
- لە یەك کاتو لە ڕووبەرێکی دیاریکراودا شەڕی هەموو هێزەکانی پێشمەرگە بکات.
- چەکی ستراتیژی ئاراستەکراو لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا بەکاربهێنێ.
- پێگەی ناوچە تەوەرەیی‌و ستراتیجەکان بۆ سوپاکەی کۆنترۆڵ بکات.
- هەموو سەرچاوەکانی بژێویی، ڕووەکانی ئاوەدانی‌و نیشتەجێ لە کوردستان دا نەهێڵێ.
- لە ژێر گوشاری لەشکرکێشی‌و سوپایی‌دا پرۆسەی ڕاگواستن جێبەجێ بکات.
- مەڵبەندەکانی پێشمەرگەو سەرکردایەتی لە ناو سنورەکانی نیشتمان دا دەرپەڕێنێ.

چونکە سەرکردایەتی (ی.ن.ك)، هەر لەگەڵ فراوان بوونی شۆڕش و چالاکییەکانی پێشمەرگەدا، بارەگاکانی خۆی لەسەر سنورەکانەوە بەرەو قولایی و نزیك شارەکان بردووەو مەڵبەندەکانی پێشمەرگەی لە سنورو ناوچەیەکەوە بۆ شوێن و جێگایەکی تر گواستۆتەوە. شەڕی خوێناوی چەند مانگەی لە دژی هێزەکانی بەعس ئەنجام داوە، بەلام هیچ کاتێك ئامادە نەبووە پێشمەرگەو بارەگاکانی خۆی بباتە ناوخاك و ولاتێکی ترەوەو چارەنوسی شۆڕشەکەی بە سیاسەت و بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتی خانەخوێ ببەستێتەوە.



## ١٤/ چەکی کیمیایی لە دژی هێزەکانی پێشمەرگە.

ئەوپەڕی نائومێدی و بێ توانایی ڕژێمەکەی بەعسیان ئەخستە ڕوو. چونکە بەکارهێنانی ئەم چەکە وێران کارییە، گوزارشتی لە دەستە پاچەیی سوپایەك ئەکرد کە نەتوانن لە ڕووی مەیدانییەوە سەرکەوتنی سەربازی بەدەست بهێنن و شەڕەکانیش لە قازانجی هێزەکانی پێشمەرگەدا یەکلایی ببنەوە. چونکە سوپایەك هەمیشە دۆڕان و شکست چاوەڕێیانی ئەکردو زەبەلاحی چەك و ژمارەی هێزەکانیان نە ئەبوونە ڕێگر لە بەرامبەر جێبەجێکردنی چالاکییەکانی پێشمەرگەدا. ئیتر بەکارهێنانی چەکەکە دوای ئەو گۆڕانکارییانە هات کە هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە ڕووی چەندایەتی و چۆنایەتییەوە بە خۆیانەوە بینییان و بەعسی دەسەلاتداریش فرمانی بۆ هێزەکانی دەرکردبوو کە بە شێوەیەکی بەربلاو لە دژی سەنگەرەکانی پێشمەرگە پیادە بکرێت و چەکەکەش لە ڕێگای (فڕۆکەو تۆپخانەو کۆپتەر)ەوە ئەنجام ئەدران. بۆ ئەم مەبەستەیش لە ١٩٨٧/٤/١٥دا بۆ یەکەمین جار هێزەکانی ئاسمانی عێراق بنکەو بارەگاکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان–یان لە (هەڵەدن و بەرگەڵوو) کیمیاباران کرد.

لە کاتێك دا، پەرەسەندنی پەلاماردانەکانی لەشکری عێراق بۆ سەر سەرکردلیەتی و مەڵبەندەکان، پێویستی دەکرد ژمارەیەکی زۆر لە تیپەکانی پێشمەرگە بۆ پارێزگاری کردن لە دەوروبەری ناوچەکەدا کۆببنەوەو لە بەرامبەردا سەنگەری شەڕکردنیان لێ بگرن. ئەمەش دەرفەتی بۆ سوپاکەی بەعس ئەڕەخساند بۆ ئەوەی بۆمبا کیمیاییەکانی بە خەستی بەکار بهێنێ و هەر جارەش گوندو شاخ و لوتکەیەك داگیر بکات و لەوێشەوە هێزەکانی خۆی بۆ

پەلاماردانی نوێ ڕێك بخاتەوە. بەڵام هێزەکانی پێشمەرگە بێجگە لە بەکارهێنانی (ئەترۆپین) کە دەرزییەکی دژەکیمیایی بووە، هیچ هۆکارێکی تریان بۆ خۆپاراستن لەبەر دەست دا نەبووە تا لە کاتی پێویست دا بەکاریان بهێنن، لەوانەش وەك نەبوونی (ماسكو جلووبەرگی کیمیایی)، بەڵکوو تەنها ئەو ئامۆژگارییانە نەبێت کە لەسەر زاری کادرو فەرماندە عەسکەرییەکانەوە ئاراستەی پێشمەرگە دەکران، وەك (هەڵکشان بەرەو بەرزاییەکان، ڕۆیشتن بە پێچەوانەی ڕێرەوی باوە، تەڕکردنی جامانەو دەسەسڕ، داپۆشینی دەمو چاو، بەکارنەهێنانی ئاوو خۆراکی بەرکەوتوو، شۆرینی جلووبەرگو ئەندامەکانی لەش). هەروەها چەند نامیلکەیەك لەم بارەیەوە بڵاوکرانەوە.

چەکی کیمیایی، کەمەرشکێنی چالاکییەکانی پێشمەرگە بوون. بە تایبەتی لەسەر وەختی ئەنفالەکان دا بە شێوەیەکی بەربڵاو لە دژی هێزەکانی پێشمەرگەو دانیشتوانی گوندنشینەکان ئەنجام دران‌و لەسەر دەستی سەرانی بەعسیش گەورەترین تاوانی کۆمەڵ کوژی‌و لەناوبردنی کوردیان لە مێژووی مرۆڤایەتی دا تۆمارکرد. ڕێکخراوی (نەتەوەیەکگرتووەکان)یش، وەك دەزگایەکی نێودەوڵەتی بۆ پاراستنی ئەمن‌و ئاسایش، وەکوو چۆن لە ڕاست ئەو تاوانانەی کیمیابارانی (شاری هەڵەبجە)دا بێ دەنگییان کرد، هەر ئاهواش ڕژێمی عێراقیان بە دەست کراوەیی هێشتەوە تا بە دڕندانەترین شێوە چەکی کیمیایی دەرهەق بە ناوچەو دەشت‌و شاخ‌و ئاوابییەکانی تری کوردستان بەکاربهێنێ. بەڵام هێزەکانی پێشمەرگە ڕوویان کردە شاخە سەختەکان‌و دوای بەرگرییەکی چەند مانگی لە دژی شاڵاوەکانی ئەنفال، سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ ناوچەکان‌و لە دەستەی پارتیزانی بچووك بچووك دا خۆیان ڕێکخستەوە.



## ١٥/ دەسپێکی لەناوبردنی ئاوابییەکان.

حکومەتی عێراق، بە کردەوە ساڵی (١٩٨٥) نەخشەی لەناوبردن‌و کاول کردنی ئاوابییەکانی کوردستانی دەست پێکردووە. لە هەلوومەرجێکی دژواردا دانیشتوانی گوندەکانی ڕووبەڕووی گەمارۆدان‌و کوشتن‌و کارەساتی یەك لە دوای یەکی تاوانەکانی کردۆتەوە. هەر لەو سەروبەندەدا ژمارەیەك لەو ئاوابییانەی کە هەندێ لە خزمەت گوزاری

(تەندروستیو قوتابخانەو تەزوی کارەبا)ی پێ بەخشی بوون، لەوانیش ئەسەنرێتەوەو سنوری ئاوایییەکان بە شێوەیەکی گشتی لەئیدارەی شارەکان ئەپچڕێو دانیشتوانەکەی لە هەموو پێداویستییەکی ڕۆژانە بێبەش ئەکات. هەروەها ناوچەکان بە (مناطق محرمة) ناو دەباتو لەسەر چەقی هەر ڕێگایەك دا سەیتەرەیەکی سەربازی قوت ئەکاتەوە. ژمارەی ئەو ئۆتۆمبیلانەش کە ڕۆژانە لە نێوان گوندو شارەکان دا هاتووچۆیان ئەکرد، بە ڕادەی سێ لەسەر چوار کەم کرانەوەو گیروگرفتی جۆراوجۆریان لەبەردەم سەرنشینەکانی دا دروست ئەکرد. بۆیە ڕوداوەکانی ئەو ساڵەو هی ساڵانی بەرەو دوا، بە سەرەتاکانی لەناوبردنی ئاواییەکانو خەڵکەکەی ئاماژەیان ئەکرد. چونکە تاوانەکانی ڕژێمی عێراق لە چەندین بواردا بەڕێوە ئەچوون، لەوانەش:-

- سەپاندنی ئابڵوقەیەکی ئابوری فرەلایەن بەسەر ئاواییەکان دا.
- داخستنی ڕێگاوبانەکانی هاتووچۆ بە ڕووی هاوولاتیانی مەدەنیدا.
- بڕینی بەشەخۆراکی گوندنشینەکان بە فرمانی دامو دەزگا ئەمنییەکانی بەعس.
- تەقەکردنی سوپا لە مەڕو ماڵات، خەڵەو خەرمانو سوتاندنیان.
- گوللەباران کردنی لادێنشینەکان لەناو کێڵگەو سەرجادە گشتییەکان.
- تەخت کردنو سوتاندنی هەر ئاوایییەك لە دوای بەرپابوونی شەڕێکی پێشمەرگانە.
- بۆردومان کردنی کوێرانە بە فڕۆکەو تۆپخانەو کۆپتەرو پیلاتۆز،
- کیمیاباران کردنی ئاواییەکان بە شێوەیەکی بەربڵاو.

سەرەڕای ئەم تاوانانەی ڕژێمیش، خەریك بوو دانیشتوانی گوندەکان لەگەڵ بارودۆخەکەی گەمارۆدانو نەبوونی خۆراكو سوتەمەنیو بۆردومانو فڕۆکەو تۆپخانەو چەکی کیمیایی خنکێنەردا خۆیان بگونجێنن، ماڵەکانیان لە دەرەوەی ئاواییەکان دروست کردو ژیانی کەلۆزو ناو هەردەو ئەشکەوتەکانیان هەڵبژارد. بەلام لە ١٩٨٧/٦/٣دا ئەو کاتەی کە پۆستی ڕەها بۆ لەناوبردنی کوردو کاول کردنی ئاواییەکان بە (علی حسن مجید) درا، بە فەرمانی سەرەکی صدامو لەسەر دەستی گەورە ئەفسەرانی فەیلەقەکانی (١)و (٢)و (٥)ی سوپاکەی بەعس، گەورەترین تاوانی جینۆسایدی کوردیان لە ماوەی چەند مانگێك دا جێبەجێ کرد.



## ١٦/ کیمیابارانی هەڵەبجە.

لە ١٩٨٨/٣/١٦دا پێنج هەزار کەس لەژن‌و پیاوو منداڵ‌و گەورەساڵ لە شاری هەڵەبجەدا، لە ماوەی چەند خولەکێك بە گازی ژەهراوی خنکێنـەر گیـان لـە دەسـت دەدەن‌و بەسـەدانی تریش لە بریندارەکان، لە ڕێگادا بەرەو ئـێران شـەهیدو کـەم ئـەندام ئـەبن. دیـارە کوشـتن‌و لەناوبردنی خەڵکەکەی شاری هەڵەبجەو ئازاردانیان، یەکێك بووە لە ئامانجەکانی بەعس‌و لـە مێژ ساڵە پاساوی عەسکەری‌و سیاسـی‌یان بـۆ ئامـادە دەکـات، تـا ئـەو شـارەو ناوچـەکانی دەوروبەری لە دانیشتوانەکەی دابڕێ‌و خەڵکەکەی ئاوارەی نێو شارەکانی تر بکات. چونکـە شـارەکە ئـەوەندەی کەسـایەتی تێکۆشـەرو نیشـتمان پـەروەری تیـا هەڵکـەوتووەو شـوێنی شایستەیان لەناو بزوتنەوە نەتەوایەتی‌یەکانی کورددا بەجێهێشتووە، هێنـدەش ناوچـەکانی دەوروبەری لانکەی شۆڕش‌و پێشمەرگایەتی بووە. بایەخێکی گرنگیان بۆ شەڕی (پارتیزانی‌و بەرگری کردن‌و مانەوە) هەبووە.

بۆ ئـەم مەبەسـتەیش، لـە کـاتێك دا ڕژێمـی فـەرمانڕەوا بەرەیـەکی تـازە لـە جەنگەکـەی عێراق– ئـێران لـە کوردسـتان دا ئەکاتـەوە، چیاکـانی دەوروبـەری ئـەم شـارە ئـەکات بـە سەکۆیەك‌و پەلاماردانەکانی بـۆ سـەر ئـێران دەسـت پێدەکـات. تـا جـەنگێکی کاولکـاری لـە ناوچەکەدا ئەکەوێتەوەو سەروماڵی چەندین هەزار مرۆڤی کوردی تیا بە سووتەمەنی ئەکات. هـەروەها جێبـەجێکردنی ئـەم تاوانـە گەورەیـەش چـەند هۆکـارێکی (ئقلیمـی‌و نـاوخۆو نێودەوڵەتی) لە پشتی‌یەوە وەستاون، لەوانە:–

- بوونی پاساوەکانی هێرشی ئێران بۆ سەر شارەکە.
- کوردبوونی شارەکەو هەڵوێستی نەگۆڕیان لە شۆڕش‌و خەبات کردن دا.
- ڕۆڵی بەرچاویان لە دەست پێکردنەوەی خەباتی چەکداری لە شاخەکانی هەورامان دا.
- نەبوونی پیاوانی دڵسۆزو پەیڕەوانی حزبەکەی بەعس لەناو شارەکەو دەوروبەری‌دا.
- تۆڵەکردنەوە لە ڕاپەڕینەکـەی ١٩٨٧/٥/١٣ی شـاری هەڵەبجـە کـە لـە دژی ڕاگواسـتنی (٥٢) گوند ئەنجام درا.
- گورز وەشاندن لە بەرەی کوردستانی کـە ڕۆڵێکـی سـەرەکی‌یان لـە ڕزگـارکردنی شـاری هەڵەبجەدا بینی.

- دروست کردنــی فشـار بۆ ئـەوەی هێزەکـانی ئێران لـە شـارەکەو دەوروبـەری ناچـاری پاشەکشێ بکات.
- نەبوونی ناوەندێکی نێودەوڵەتی بۆ سزادانی تاوانەکانی پێشووی سەرانی بەعس.

وەك لە دوایی‌دا دەرکەوت، ژمارەی شەهیدو قوربانی‌یەکانی شاری هەڵەبجـە لـەوە زیـاتر بوون، لە چاو ئەو ئامارانەی لە ڕێی کەناڵــەکانی ڕادیـۆو تەلـەفزیۆن‌و ڕۆژنامـەکانی دەرەوە بڵاوکرانەوە. چونکە کامێراکانی وێنەگرتن‌و ڕۆژنامەنووسەکان بەو گەورەییە کارەساتەکەیان نەخستە ڕوو. بەوردی‌و لە کاتی خۆی‌دا وێنەی تاوانەکانیان نەگرت‌و زانیـاری تێروتەسـەلیان بە گوێی جیهان دا نەدا. لەبەرئـەوەی تراژیدیاکـە هـەر تەنـها ئـەو قوربانی‌یانـە نـەبوون کـە لەسەر ڕێگاوبانەکان‌و لە نێو ژمارەیەك تراکتۆرو ئۆتۆمبێل لارو پـاڵ کـەوتبوون، بـەڵکوو بـە سەدان جەستەی تیاچوو لەو (بنکانە)دا دۆزرانەوە کە خەڵکەکەی لـەتاو ناپـاڵم‌و بۆردومـانی فڕۆکە جەنگی‌یەکانی عێراق خۆیان خزاند بووە ناویانەوە. هەروەها ئـەو هاووڵاتی‌یانـەی کـە هەر لە بناری (شنروێ)وە گیان لە دەسـت دەدەن‌و ژمارەیـەکی تریـان بـە بریـنداری بـەرەو دڵمێنی (عەزیز ئەترووشی)و (ملەی چاپخانەکە) بە دەم گریان‌و پێکەنین‌و چـاو بـە فرمێسـكەو هەڵئاوسانەوە بەرێ دەکەون‌و لەوێش بە تەواوی لە پەلوپۆ ئەکـەون. بەسـەدانی تریـش لـە خەسـتەخانەکانی (پـاوە)و (سـنە)و (کرماشـان) شـەهید ئـەبن. بـەڵام هـەمووی لـە چـاوی وێنەگرتنی کامێراکان‌و لە پێنوسی ڕۆژنامەنووسەکان دور ئەبن‌و ناتوانن وەکوو خۆی ئـازارو ئامارەکانی ئەو کارەساتە جەرگ بڕە تۆمار بکەن.



## ١٧/ پرۆسەی (ئەنفال)ی کورد.

جێبەجێکردنی ئەنفال، ئەوەندەی کارەساتێکی نەتەوەیی‌و نیشتمانی بۆ ئەو ڕۆژگـارەو ئەمڕۆو پاشەڕۆژ بە زیندوێتی لە ویژدان‌و بـیرەوەری کۆمـەڵانی خـەڵکی کوردسـتان‌و هـەموو جیهان دا بەجێ هێشـتووە، ئـەوەندەش گوزارشـتی لـە گـەورەترین تاوانـەکانی بـەعس‌و لـە دڕندەیی سەرکردەکانی ئەو دەمەی ئەنفال کردوە کە چۆن لە ماوەی چەند مانگێك دا پتر لە (١٨٢)هـەزار کـوردی لـە هاووڵاتیـانی گوندنشـینەکان بـە ئـاگری دۆزەخەکـەی سـوتاندووەو

هەرچی ڕووپەکی ئاوەدانی هەبووە، بە (دینامیتو بلدۆزەر) لەگەڵ خاکەکەیدا یەکسانیانی کردووە.

چونکە صدامو ڕژێمەکەی بۆیان دەرکەوتبوو، کە ئیتر ئەو سیاسەتانەی لە (ڕەشەکوژیو دڵپاکوسینو پرۆسەی تواندنەوە) لە پێشوودا گرتوویانەتە بەر، نەك هەر نەیانتوانیوە کورد لەسەر داوای مافەکانی خۆی سارد بکەنەوەو چاویان بترسێنن، بەڵکوو هانیان بدات بۆ شۆڕشو یاخی بوونی گشتی لە شاخو شارەکان داو ئەمنی ستراتیجی بەعس بخەنە بەر هەڕەشەکانی مەترسییەوە. بۆیە جیانەکردنەوەی پێشمەرگەیەکو هاووڵاتییەکی مەدەنی لەناو یەك دەستاری کورد هاڕین دا پرۆسەکانی ئەنفال بەڕێوەچوونو تاوانەکانی جێبەجێکردنی ئەم ڕێو شوێنانەیان گرتۆتەبەر:-

- کیمیاباران کردنی چەند ناوچەیەك بەر لە دەست پێکردنی پەلاماردانەکانی لەشکری ئەنفال بۆ سەر ناوچەیەك.
- هێرشی سوپایی چەند قۆلی بە پاڵپشتی سەدان یەکەی سەربازی، حرس جمهوری، جاش، کۆپتەر، تۆپخانە، مدرعە، تانك.
- دەسگیرکردنی هاووڵاتیان لەناو گوندەکانو لە بنکەکانی خۆشاردنەوە لەسەر دەستی سەربازەکانو پیاوانی سیخوڕو جاشو تۆکەرانی بێگانە.
- گواستنەوەی ئەنفال کراوەکان بە زیلو ئیڤاو منشأةو ئۆتۆمبیلی جام تاریكو داخراو لە قافڵەیەکی عەسکەریدا بۆ ناو گرتووخانەکانی مردن.
- زیندانی کردنیان لە ناو قەڵاو قوڵلە سەربازییەکان، بەڕێوەبەرایەتییەکانی ئەمن، دەزگاکانی پۆلیس، لە پاشان گواستنەوەیان بۆ ناوەندێکی سەرەکی.
- جیاکردنەوەی ژن لە پیاو، کوڕیە لە دایکەکەی، کوڕ لە باوك، کچ لە دایکی، مێرد لە هاوسەرەکەی، لاوانو کچان لە خێزانەکانیان.
- فرۆشتنو دابەش کردنی کچانو ژنانی کوردە ئەنفال کراوەکان بە سەر پیاوانی بەعسو وڵاتە عەرەبییەکان.
- گوللەباران کردنی لاوەکان بە لێواری ئەو چاڵانەوە کە پێشووتر بۆ شاردنەوەیان هەڵکەنرابوون.
- گیان لە دەست دان بەهۆی گەرماو تینوێتیو برسێتیو بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەوە.
- تاقی کردنەوەی چەکی (کیمیاییو بایەلۆژیو ئەتۆمی) لەسەر ئەنفال کراوەکان.

- زینده بەچاڵ کردنی منداڵو ژنو بە ساڵاچووان لە گۆڕی تاکو بە کۆمەڵ دا.

ئەم تاوانانەش لە ١٩٨٨/٢/٢٢ دەستیان پێکردو دوای (٦)مانگو نیوو لە کاولکردنی کوردستانو دەسگیرکردنی دانیشتوانەکەی، پرۆسەی ئەنفال کردنی کورد کۆتاییان پێ دێ. لە کاتێك دا هێزە چەکدارەکانی بەعس، بەبەرچاوی هەموو رێکخراوە نێودەوڵەتی یەکانو رای گشتی جیهانی یەوە، (٨) بەیانی عەسکەری لەسەر پەلاماردانەکانیان دەرئەکەنو بەوپەڕی شانازی یەوە لە دەزگاکانی راگەیاندن بڵاویان ئەکەنەوە. هەروەها بە هەزاران کەسیش لە دەرباز بوانی هێرشەکانی ئەنفال روو ئەکەنە ئێرانو سنورەکانی تورکیا، بەبێ ئەوەی دامەزراوەی (نەتەوەیەکگرتووەکان)و (دادگای لاهای) بۆ تاوانبارانی جەنگو جینۆساید کردنی مرۆڤ لە جیهان دا، شاڵاوەکانی ئەنفال بووەستێنن. یان لایەنی کەم رەفتارو کردەوە سەربازی یەکانی رژێمی عێراق سووکو ریسوا بکەن. بەڵام ئەم کارەساتە بۆ کورد، وتارێکی نەتەوەیی چارەنووس ساز بەرهەم ئەهێنێو تەنها دەرفەتێکی سیاسی بەس بووە تاوەکوو هەڵچوونێکی جەماوەری هەموو کوردستان بگرێتەوە.

  

((ناوەرۆك))

پێشکەشە. ٢
پێشەکی. ٥
کوردو کوردستان.. نەتەوەو نیشتمانی لەت لەتو ئاگرداني شۆڕش. ٧
بەشی یەکەم/ پرۆژەی ئامانجە دوورو نزیکەکانی شۆڕش. ١٧
١/ لە ڕووی سیاسی یەوە. ١٩
٢/ لە ڕووی پێشمەرگایەتی یەوە. ٣٠
بەشی دووەم/ سالّی (١٩٨١)و ڕەوشی ناوچەکانی ژێر دەسەلاّتی پێشمەرگە. ٣٧
بەشی سێیەم/ مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕش. (یەکەمین قۆناغی شۆڕش). ٤٧
١/ ڕوون کردنەوەی ڕێبازی شۆڕش. ٦٢
٢/ مین چاندن. ٦٨
٣/ دەستگیرکردنی کارکەری بیانی . ٧٠
٤/ ورياکردنەوەی خۆفرۆشانی نەتەوە . ٧٣
٥/ هەلّمەتی لەناکاو بە تفەنگو نارنجۆکی دەستی و دەمانچە. ٧٦
٦/ لێدانی بۆسەتانەوەی جاشو عەسکەری. ٧٨
٧/ ڕفاندنی چەك تایپو ڕۆنیۆ، دلودەرمان . ٧٩
٨/ شەڕی خالّە لاوازەکانی دوژمن ٨٠
٩/ دەستگیرکردنی پیاواني سیخوڕو تاوانبارانی گەل. ٨١
١٠/ دەست وەشاندن لە پرۆژەکانی ئابووری دەولّەت. ٨٣
بەشی چوارەم/ ڕۆڵی شارەکان لە کوڕی خەبات دا. ٩١
١/ ڕێکخستنی ناوشارەکان. ٩٤
٢/ هەلّوێستی ڕوناکبیرانی نەتەوە. ٩٧
٣/ یەك دەنگی چینو توێژەکانی کۆمەلّ. ١٠٢
بەشی پێنجەم/ گرنگی ئاواییەکان لە شۆڕشی شاخ دا. ١٠٥
١/ لە ڕووی ڕێکخراوەییەوە. ١٠٧
٢/ لە ڕووی پێشمەرگایەتیەوە. ١٠٩
٣/ لە ڕووی ئیداری یەوە. ١١٢

بەشی شەشەم/ لە/ شەڕی پارتیزانی بچووکو سەرەتابییەوە بۆ/ شەڕی پارتیزانی گەورەو فراوان. (دووەمین قۆناغی شۆڕش) ١١٧
١/ شەڕی ناودێ. ١٢١
٢/ شەڕی ڕەبایە گرتن. ١٢٣
٣/ شەڕی قافڵەی عەسکەری. ١٢٥
٤/ شەڕی ڕزگارکردنی شارۆچکە. ١٢٧
٥/ شەڕی پاك کردنەوەی زنجیرە شاخ. ١٢٩
٦/ تۆپ باران کردنی مۆڵگاکانی دوژمن. ١٣١
بەشی حەوتەم/ دەسکەوتە کۆمەڵایەتی‌یەکانی شۆڕش. ١٣٥
١/ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی ئاواییەکان. ١٣٧
٢/ کردنەوەی قوتابخانەکانی شۆڕش. ١٣٨
٣/ پێکهێنانی هێزەکانی پشتگیری. ١٤٠
٤/ چارەسەرکردنی بەخۆڕایی گوندنشینەکان. ١٤١
بەشی هەشتەم/ زنجیرەی سیاسەتەکانی بەعس. ١٤٣
١/ دروست کردنی جاش. ١٤٥
٢/ بە بارمتەگرتنی کەس‌وکاری پێشمەرگە. ١٤٦
٣/ بنیات نانی قەڵای عەسکەری. ١٤٧
٤/ هەڵگیرساندنی شەڕی ناوخۆ. ١٤٩
٥/ بە بەعسی کردنی (بیروباوەڕی کوردبوون). ١٥٠
٦/ پرۆسەی ڕاگواستنی بەزۆرەملێ. ١٥٢
٧/ بە عەرەب کردنی نیشتمان‌و نەتەوە. ١٥٣
٨/ تەسفیرکردنی هاووڵاتیانی فەیلی. ١٥٥
٩/ گەمەی ئاخاوتن. ١٥٦
١٠/ دروست کردنی جاش خەفیفە. ١٥٨
١١/ ژەهری سالیۆم. ١٦٠
١٢/ تیرۆرو داپڵۆسین لە نێو شاروشارۆچکەکان دا. ١٦١
١٣/ بەزۆر سەپاندنی جەنگی بەرەیی. ١٦٢

١٤/ چەکی کیمیایی لە دژی هێزەکانی پێشمەرگە. ١٦٤

١٥/ دەسپێکی لەناوبردنی ئاواییەکان. ١٦٥

١٦/ کیمیابارانی هەڵەبجە. ١٦٧

١٧/ پرۆسەی (ئەنفال)ی کورد. ١٦٨






## ئەم لێکۆڵینەوەیە...

تاقی کردنەوەی ئـەو ساڵانەی شۆرشە کـە بەبازووی هەزاران لە تێکۆشەرو گیانْ لـە سەردەستەکـانـی پـێشەوەی لـە شـاخ و گوند و شارەکان دا مێژووی تازەی بزوتنـەوە ئازادیخوازەکەی گەلی کوردیان بە خوێن و قـوربـانـی سـەرو مـاڵ نووسیوەتەوە. ئـەو سەروەری یانەی کە یەك یەك لـە نـاو شیرینی و تاڵی روداوەکـانـی دا تـەمـەنـی پێشمەرگایەتیم تیایان دا بڕیوە. هەروەها بوون بەسەرچاوەی نووسینەوەو لێکدانـەوەو شیکردنەوەی ئـەو سـاڵانەی شـۆرش کـە تیایان دا ( یەکێتی نیشتمانی کـوردستان )و ( گـەلـی کـوردسـتـان ) لـە سەخترین و درەوشاوەترین ساڵانی دەیەی هەشتاکان دا، رۆڵـی نیشتمانی و نەتەوەیی خۆیـان تـیـا بەرجەستە کرد.

-نووســەر-